

# جوگرافیای دێ نشینی

## ( کوردستانی عیراق وەك نموونە )




پ.د. خەلیل ئیسماعیل محەمەد

م. ئەیوب خەلیل ئیسماعیل


پێداچوونەوەی. د. هیوا سادق سەلیم


هەولێر ٢٠١٢

# جوگرافیای دیٚ نشینی

( کوردستانی عیراق وەك نموونە )

پ. د. خەلیل ئیسماعیل مەحەمەد
زانکۆی سەلاحەددین

م. ئەیوب خەلیل ئیسماعیل
زانکۆی سەلاحەددین

پێداچوونەوەی د.هیوا صادق سلیم

ناوەرۆك

## پێرستی خشتەکان

## پێرستی نەخشەکان



## پێرستی شێوەکان

## پێرستی وینەکان

# پێشەکی

جوگرافیای دێ نشینی بە یەکێك لەبەشە تازەکانی جوگرافیا دائەنرێ ، چونکە بایەخی جوگرافیزانەکانی نەگرتەوە تابەستنی کۆنگرەی جوگرافی نێو دەوڵەتی لە ساڵی ( ١٩٢٥ ) لە شاری قاهیرە.دوای ئەمە لێکۆلینەوە لەسەر ئەم بابەتە بە دوای یەکدا هات لە پاش پێك هینانی لیژنەیەك کە بایەخی بەم جۆرە بابەتانە دەدا .

لێکۆلینەوەی تایبەت بە دێ نشینی بەرەو پێش چوو لەلای ژمارەیەك لە وڵاتانی ئەوروپای رۆژئاوا لەوانە: ئەلمانیا ، فەرەنسا ، بەریتانیا ، هۆلەندا.ئەمەش کارێکی سەیر نیە چونکە جوگرافیای دێ نشینی بابەتێکە شایەنی ئەم بایەخیە لەبەر چەند هۆکارێك لەوانە: خانووی دێهاتی بنچینەی پەیدابوونی نیشتەجێی شارستانییە لەجیهانداوگوند شاری دروست کردووەو ئێستاشی لەگەڵ دابێ دێ خواردن پێشکەشی شاردەکات وریژەیەکی بەرزی هێزی کاری بۆ دابین دەکات.لەلایەکی ترەوە دانیشتوانی دێ تاوەکو ئێستا زۆرینەی دانیشتوانی جیهان پێك دێنن چونکە ئەوان رێژەی بەرزی دانیشتوانی ولاتەتازە پێگەیشتووەکان پێك دێنن کە سێ بەشی پێکهاتەی دانیشوانی جیهان دەگرێتەوە .

تاوەکو ئەمرۆ مشتومڕ هەیە دەربارەی واتای چەمکی (دێهاتی ) چونکە خالێکی دیاری کراو نی یە لە کۆمەلگا جێنشینە گەورەکان یان لە پێگە دانیشتوانەکان وسەنتەرەکانی جێنشینی بچووك کە لەدوایدا بتوانین بلێین کە شار کۆتای هات وادێهات دەستی پێکرد ، هەتاوەکو گەڕ کارکردنی دێهاتیەکان لە پێشەی سەرەتایی بکەینە پێوەرێك بۆ جیاکردنەوە ، تێبینی دەکەین کەولاتانێکی زۆری جیهان یەکسان نینە لە

پلـــەی خـــۆ تـــەرخان کردنـــی دانیـــشتوانی بۆپیـــشەی شـــاری یـــا دێهـــاتی کـــە ئەمەش ئەوە دەگەیێ تێکەڵێك هەیە دەربارەی ئیشکردن تیایدا .

بۆیـــە دابـــەش کردنـــی ئیعتیبـــاری بـــوونی دەبـــێ لـــە وڵاتانـــدا.چـــونکە هەریـــەك لـــەوان بـــەپێی بۆچـــوونی خـــۆی وبـــە پێـــی ئـــەو ئیعتیبارانـــەی کـــە هـــەڵی دەبژێرێت بۆ جیاکردنەوەی دێ لە شار کاردەکات .

بابـــەتی (دێ نـــشینی) بۆیەکـــەم جارخرایـــە نێـــو بابەتـــەکانی بەشـــی جوگرافیـــا لـــە زانکۆیـــە عیراقیـــەکان لـــە تـــەمووزی ١٩٨٧بـــەپێی بڕیارەکـــانی کـــۆنگرەی ســـێیەمی خوێنـــدنی بـــاڵا کەلەوســـاڵەدا بەســـترا، لەوســـاوە تائێـــستابەشی جوگرافیـــا پـــشتی بـــە کتێبـــی "جغرافیـــە الاســـتیگان الریفـــی"دەبەســـت لـــە نوســـینی بـــەرێزان (دکتۆرســـەبری فـــارس ئـــەلهیتی ودکتـــۆر خـــەلیل ئیـــسماعیل محمـــد)ە کـــە لەســـاڵی ١٩٨٩زچـــاپکراوەوبەزمانی عەرەبیـــە.گومـــانیش نیـــە کـــە کـــاتیکی زۆر بەســـەر تێپـــەر بـــووەو لەگـــەڵ دۆخـــی ئێـــستای هـــەرێمی کوردســـتان نـــاگونجی.بۆیـــەش وەکوپێویـــستیکی هەنوکـــەیی پرۆگرامیکـــی خویندن،ئـــەم بابەتـــەمان نووســـیەوە. دوای ئـــەوەی بابـــەتی تـــازەی خرایـــە ناوونمونـــەی دێ نشینیـــشی لـــە ســـەر هـــەرێمی کوردســـتانی لـــە خـــۆگرت . بۆیـــە ئـــەم هـــەنگاوە دەبێتـــە گواســـتنەوەیەکی جـــۆری لـــە ڕێگـــای نوێکـــاری وپێـــشکەوتنی زانـــستی کەلـــە پرۆگرامـــە زانـــستیەکان دێتـــە دی ،ئـــەم کتێبـــەش بـــا یـــەخی بـــە زۆرێـــك لـــەو بابەتانـــە داوە کەپەیوەنـــدارە بەرەهەندوســـیـستەم وئامانجـــەکانی بەشـــی جوگرافیا .

بابەتـــەکانی ئـــەم کتێبـــە دابەشـــکراوە تـــە سەرشـــەش بـــەش،دکتۆر (خـــەلیل ئیـــسماعیل محمـــد ) بەشـــەکانی یەکـــەم ودووەم وســـێیەم وچـــوارەمی دانـــاوە

بــــه عـــــەرەبی لـــــە کاتێکـــــدا مامۆســـــتا (ئـــــەیوب خــــەلیل ئیـــسماعیل ) وەرگێراوەتە کوردی وبەشی پێنجەم وشەشەمیشی نووسیوەتەوە .

هیــــوادارین کەســــەرکەوتوو بــــبین لـــــە پڕکردنـــــەوەو دۆزینــــەوەی پێویـــستیەکانی ئـــــەم بابەتـــــە گرنگەوخزمـــــەتێکی ســـــادەی کتێبخانـــــەی کوردیمـــان کردبـــێ کـــە تـــاوەکو ئێـــستا پێویـــستی بـــوونی بـــۆ ئـــەم جـــۆرە کتێبانـــە لـــەو بەشـــە لـــە زانینـــی جـــوگرافی مـــاوە ، بەتایبـــەتی ئـــەوەی بایـــەخی بـــە دێ نـــــشینی لـــــە هـــــەرێمی کوردســـــتان بـــــە شـــــێوەیەکی وورد دەدات،هەروەکو چۆن لەم کتێبەدا هەوڵمان بۆی داوە .

نیسانی – ٢٠١٢

# بەشی یەکەم

## سەرهەڵدان ورەهەندی مێژوویی دێ نشینی

سەرهەڵدان وبەرەوپێشچوونی بابەتی دێ نشینی:

نیشتەجێی یا ئاوەدانی مرۆیی، لقێکی نوێیە یە لە جوگرافیادا و دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاکانی سەدەی بیستەم . گرنگترین مەبەستی بەیەکەوە بەستنی نێوان دیاردەکانی رووی زەوی و خەسڵەتە فزیۆگرافیەکانی شوێن لەلایەکەوەو هەڵبژاردنی شوێنی نشینگەکانە بۆ مەبەستی دیاریکراو لە لایەکی ترەوە. کاتی جوگرافیزانیك دەروانێتە بارودۆخی ئێستای دابەش بوونی نشینگە مرۆییەکان لەو کاتە دا ئاشنای ئەو ژینگە جۆراوجۆرانە دەبێتەوە کە هەر هەرێمێك پەیوەستە پێیەوە، لەروانگەی جیاوازی دابەش بوونی چڕی نشینگەکان و هەمە جۆریان و بەدیاری کردنی ئەم جۆرە نشینگانەو جۆری پەیوەندی لە نێوان دانیشتوان لە لایەکەوە و ئەو ژینگە سروشتیەی کە تیایدایە لە لایەکی ترەوە، دەتوانێت جۆری جیاوازی نیشتە جێبوون دەست نیشان بکات .[1]

وە لەم دوایەدا بواری لێکۆڵینەوە لەم بابەتە فراوانتر بوو لایەنی کۆمەڵایەتی و ئابووری و ئاوەدانکردنەوەی نشینگەکانی گر تە خۆووەکو چۆن جوگرافیا بایەخ بە لێکۆڵینەوەی مرۆڤ دەدات لە رووی دابەشبوون و بڵاوبوونەوە ئەوهاش بایەخ بەبەکارهێنانی زەوی لە بوارە جیاجیاکان دەدات لە پێشەوەی هەمووشیان هەڵبژاردنی مرۆڤ بۆ پێگەیێکی دیاریکراو بۆ جێگیربوون جگە لە شوێنەکانی ترو کردنی بەلانەی ئاوەدانی. لێرەدا فلبریك A.K.philbrick لە پێناسەی بۆ جوگرافیاجەختی لەسەر شیکردنەوەو روونکردنەوەی جۆری نشینگەکانی مرۆیی و ئاوەدانیکردنی بۆ زەوی کردووە.[2] هەر چەندە ئەو لێکۆڵینەوانەی کە تایبەت بوون بە ئاوەدانکردن بە تەنها جەختی لەسەر جۆری خانوو کەرستەی بینای بەکارهاتوو نەدەکرد بەلکو بایەخی بە لایەنەکانی تایبەت بە دابەشبوون و پۆلێنکردنی خانووەکان و رێکخستنی شوێن بۆ خانوو نشینگەکانیش

دەکرد.[٣]ئەم جۆرە لێکۆڵینەوانەش وادیارە سەرنجی قوتابخانەی جوگرافی فەرەنسی بۆ خۆی راکێش کردووە زۆرێك لەزاناکانی لێکۆڵینەوەی وردیان لەسەر نشینگە فەرەنسیەکان ئەنجام داوە . هەروەها ئەڵمانەکانیش رۆڵێکی لێکچوی فەرەنسیەکانیان گێراو ئینگلیزەکانیش سنوری لێکۆڵینەوەکانیان فراوانتر کردو نشینگە دێهاتیەکانی گرتە خۆهەلە پاڵ سەنتەری شارەکان وناوی جوگرافیای (نیشتەجێ بوون) یا( ئاوەدانی مرۆیی) یان لێ نا (Geography of settlement). گومان نییە بایەخدانی جوگرافیا بە خانوو بایەخدانێکە بە دیاردەیەك کە پەیوەستە بە ناوجەرگەی ژیانی مرۆڤ وکاری جوگرافیزانە کە روانگەی بابەتی قوولتر بکات بازنەی توێژینەوەی گۆرەپانی فراوانتر بکات، بۆ گەیشتن بە هەڵسەنگاندنێکی پرۆسەی جێنشینی، جۆرەکانی نشینگەکان و بەدواداچوونی هۆکارە کاریگەرەکان نیشتەجێی لادێی. [٤] لێکۆڵینەوە دەربارەی جۆرەکانی نشینگە دێهاتیەکان بەرەو پێشچوون و دابەشبوونی لە پاڵ بایەخدان بە خانووی لادێی بەشێکە لە جوگرافیای نیشتەجێ بوون.جوگرافیای دێ نشینی چەند ئامانج و مەبەستێکی هەیەکە گرنگترینیان ئەمانەن [٥]:

١. سەر هەڵدان و گەشەکردنی نشینگە دێهاتیەکان.
٢. نیشتە جێ بوونی هەمیشەیی و نا هەمیشەیی.
٣. شێوازی دابەش بوونی نشینگە دێهاتیەکان و هۆکارەکانی دابەش بوونی.
٤. خەسڵەتی خانووە دێهاتیەکان و شێوازی دابەش بوونیان .
٥. دانیشتوانی دێهاتیەکان، کێشەیان و پەیوەندی یە هەرێمایەتیەکان.
٦. دابەش بوونی هەرێمی بۆ خانووی دێهاتی.

لە گەڵ ئەوەی دێ لەشار پێشوترە لە ئاوەدانکردنەوە، بەڵام ئەو لێکۆڵینەوانەی کە تایبەتە بە دێهات لە رووی زەوی‌وئاوەدانی درەنگتر بایەخی پێدرا بە بەراوردلەگەڵ دیراسەتکردنی شار .ئەم جۆرە لێکۆڵینەوانە رێچکەی تایبەتی گرتە خۆ دوای جەنگی جیهانی دووەم. بەڵام ئەوە ناگەیەنێ کە بابەتەکانی نیشتەجێی لادێی لێکۆڵینەوەی

ـسەرنەکرابێت یاخود جوگرافیزانەکان باسیان نەکردبێ چونکە هەندێك لێکۆڵینەوە
هەیە کە بایەخی بە نیشتەجێبوونی دێهاتی دابێت بەشێوەیەك لە شێوەکان و لە ماوەیەکی
دوورتر لەوەی باسکراو لە رێگەی چەند بابەتێك لە جوگرافیای دێهاتی چ کشتوکاڵی
ـ چ ئاوەدانکردنەوە[٦] یاخود لە نێو بابەتەکانی بەکارهێنانی زەوی لە ناوچە
دێهاتیەکاندا[٧] هەوڵەکانی ریتر (Ritter) ١٧٧٩-١٨٥٩ لەم بوارەدا بەسوود بوو
هەتیەتی لە کاتی لێکۆڵینەوەی لەسەر جۆرەکانی خانووی دێهاتی و شێوەکانی و
دابەشبوونی و هۆکاریی کارتێکردووی، کە ئەمەش وادەکات چاکەی سەرهەڵدانی
سەرەتایی جوگرافیای دێ نشینی بۆ ئەو بگەرێنینەوە. هەروەها کامیل ڤالانکس( Camill
Vallanx) لە پێشەنگی ئەو کەسانە دادەنرێ کە چوارچێوەی تیۆری بۆ پرۆگرامەکانی
نیشتەجێی دێهاتی دانابیت.[٨] لە بەر ئەوەی دێ ، بوارێکی لێکۆڵینەوەیە بۆ هەموو
زانستە کۆمەڵایەتیەکان ،شتێکی ئاسایی بوو جوگرافیزانەکانیش - کەبایەخ بە
لێکۆڵینەوەو شیکردنەوەی پەیوەندیەکانی نێوان مرۆڤ و ژینگە دەدەن- دەست بکەن بە
دیاریکردنی دابەشبوونی جوگرافی دیاردە هەمە جۆرەکانی دێهات.

دەکری زانابیر جورج ( pieer George) بە یەکێك لە گرنگترین ئەو کەسانە
دابنێین کە لێکۆلینەوەی دەربارەی دێهات ئەنجام داوە و ئەم جۆرە پەیوەندیانەی
شیکردۆتەوە لە کتێبەکەی- جوگرافیای دێهات Precis de Geographic
(Rural لە ساڵی ١٩٦٣ [٩] لە نێوان ئەم جۆرە لێکۆلینەوانەش لێکۆلینەوەی متزن (
A .meitzei) ساڵی ١٨٩٥ دەربارەی نیشتەجێی دێهاتی و خانوو لە ئەڵمانیا لە
کتێبەکەی (الزراعه و السكان فی شرق و غرب المانیا) Siede lung and Agrar
wesender West germanen and ostgermanen کەجەختی لەسەر ئەوەش
کردەوە نیشتەجێی دێهاتی یەکێکە لە بابەتە سەرەکیەکانی جوگرافیای مرۆیی.[١٠]
هەندێکیش میتزن بەباوکی جوگرافیای نیشتەجێی نوێی دادەنێن[١١] هەروەها ڤیداڵ دی
لابلاش (١٨٤٥-١٩١٨) خانوو نیشتەجێبوونی بەیەکێك لە بابەتە گرنگەکانی

جوگرافیایی مرۆیی دانا،[١٢] لە کاتیکدا ( Emrys Jones) بابەتی دێ نشینی (بەرجەستەکان، پێگە، میرنشینی، دابەشبوون)، خستە ناوەرۆکی جوگرافیای مرۆیی لە پاڵ نیشتەجێبوونی شارستانی.[١٣]لەساڵی ١٩٠٧ هاسیرت Hassert نوسینی دەربارەی دێ نشینی هەبوو لە رێگەی نووسینەکانی لە جوگرافیای نیشتەجێ بوون.[١٤] هەروەها جیرج W.h.joerg نووسین هەبوو دەربارەی نیشتەجێ بوون و لێکۆڵینەوەی لەسەر نیشتەجێ بوون کرد لە ناوچە بەستەڵەکیەکان و لە کەنەدا. هەروەها هەریەك لە لیفیر M.A.Leferre و دوان R.Dion و سور M.Sorre و جان بیرت J.Burin ١٩٣٠-١٨٦٩ بەشداریان هەبوو لەم جۆرە لێکۆڵینەوانە.

کۆنگرەی جیهانی یەکەمی جوگرافیا کە لە قاهیرە بەسترا لە ساڵی ١٩٢٥ گرنگیەکی تایبەتی هەبوو لەم بوارەدا. چونکە بایەخی دا بەولێکۆلینەوانەی کە پەیوەستە بە نیشتە جێ کردن و دێ نشینی.ئەمەش کاریگەری دوری هەبوو لە بلاوکردنەوەی شارەزایی ئەم کۆمەڵە جوگرافیە جیهانیانە لە بواری شێوەی گوندەکان و سەرهەڵدان و شێوەی دابەش بوونی، وە لە پێش هەمووشیانەوە جوگرافی زانی فەرەنسی ( A.Demangeon ) (١٨٧٢-١٩٤٠)کەیەکەم لێکۆلینەوەی لە بواری جوگرافیای جێنشینی و بوارەکانی پێشکەش کرد.[١٥]لە کۆتایشدا کۆنگرە کە راپۆرتێکی بلاوکردەوە کە لەسێ بەرگ پێکهاتبوو لە سالانی ١٩٢٨و١٩٣٠و١٩٣١بە دەرکەوت بە ناونیشانی( INTERNATIONAL GEOGRAPHIC UNION OF COMMISSION IN TYPES OF RURAL SETTLEMENT ) . ئەم راپۆرتانەش حەزو ئارەزوی لە لای جوگرافیەکان پەیدا کرد بۆ چارەسەر کردنی بابەتەکانی دێ نشینی و نووسین لەم بوارەدا. لەم سالآنەی دوایشدا و لە پاش ماوەیەك لە سیستی، لێکۆڵینەوە دێهاتیەکان بەتایبەتی جوگرافیای دێ نشینی بەشێك لە بایەخدانی پێدرا بەتایبەتی لە ئەڵمانیا و فەرەنسا و زەویە نزمەکان و ئینگیلتەرە کە ئەمەش بە تەنها بۆ تێگەیشتنێکی چاکتری ژینگە دێهاتیە هاوچەرخەکان و

گرفتەکانی نەبوو بەڵکو بەرەو زانینکی قوڵتری بارودۆخی مێژوویی بوو کە لە ژێر سایەی جۆرەکانی جێنشینی گەشەی کردووە.

وطەنیوەی دووەمی سەدەی بیستەم چەند لێکۆڵینەوەیەکی دێهاتی بەدەرکەوت کە چەند دیاردەیکی لە خۆ گرت لەوانە:دێهات و بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی ، جێنشینی دێنی، بوژاندنەوەی دێ یا پلاندانانی دێهاتی بە مەبەستی پێشخستنی هەر یەك لە دێ شینی وکشتوکاڵ لە ناوچە دێهاتیەکان ، هەروەك لە لێکۆڵینەوەی چیشۆڵم M.Chisholm ١٩٦٢(*) و کتێبی کلوت H.D.Clout ١٩٧٢.(**) هەروەها کتێبی دۆتسون و ویبدلی ١٩٧٨.(***) جگە لە زۆرێك لە لێکۆڵینەوەی تر کە زۆربەی لە ماوەی شەستەکان و حەفتاکانی سەدەی بیستەمدا بە دیار کەوت.(****) لە کاتێکدا لێکۆڵینەوەی سەربەخۆ پەیدابوو کە بابەتی دێهات و دێ نشینی وەکو بەشێکی سەربەخۆی زانینی جوگرافی چارەسەر کرد. لەم لێکۆڵینەوانەش: کتێبی کلوت H.D.Clout، ١٩٧٧ کتێبی سنغ R.h.sing کتێبی بێکەر ١٩٦٩.(*****) لەگەڵ ئەوەی کە جوگرافیزانە سۆڤیەتیەکان نووسینیان هەبوو لە بابەتی دێ نشینی بەڵام ئەم لێکۆڵینەوانە درەنگ بە دیارکەوتو (١٦) وادیارە کە ئاراستەیەکی ئاشکراو روونی هەبووە لە بایەخدان بە جۆرەکانی نیشتەجێ بوون و دانانی پرۆگرامی زانستی بۆ نەخشەکێشانی جێنشینی،لە شەستەکان سەدەی بیستەم.(******)

لەلایەکی ترەوە نەتەوە یەکگرتوەکان رۆڵێکی باشی گێرا لەم بوارەدا وەچەندین کۆنگرەو دانیشتنی جیهانی لەلایەن (Habitat) ئەنجام درا کە چارەسەری بابەتی دێ نشینی لەووڵاتە تازە پێگەیشتووەکان دەکات و کۆنگرەی چوارەمی رێکخراوی ئەفرۆئاسیەوی لە هیندستان ساڵی ١٩٧٥ رۆڵێکی تایبەتی هەبوو لە پاڵ چالاکی رێکخراوی F.A.O کە رۆڵێکی باشی گێرا لەم بوارەدا .وە کۆمەڵێك لێکۆڵینەوەی لەماوەی هەفتاکاندا بلاووکردەوە.(x) لەعیراقیشدا لەم ساڵانەی دواییدا چەندین لێکۆڵینەوەی زانستی ئەنجامدرا تایبەت بە بابەتی دێ نشینی لە ئاستی پارێزگاکانی

وەکولێکۆڵینەوەکانی: خلیل اسماعیل ١٩٨٠،احمد الدلیمی ونبیل عبدالقادر ١٩٨٤ ،نعمان حسین ١٩٨٥ ،احمد الجبوری ١٩٨٧،عاید سلوم ١٩٨٨،محمد شرتوح وفرید شمعون ١٩٩٠،حبیب الدلیمی١٩٩٥،محمداللهونی ٢٠٠٢،ایوب خلیل ٢٠٠٣،ڕۆستەم سەلام وئەحمەد محمەد ٢٠٠٦. (XX) گومانیش نییە کە فراوانبوونی شارنشینی و ئەو پاڵەپەستۆیەی لێکەوتووە بەسەر سەنتەرەکانی شارنشینی و کەم بوونەوەی ڕێژەی دانیشتوانی دێهاتی و ئەو کەم بوونەوەی کە جێی هێشت لە دەستی کاری کشتوکاڵی و نزمبوونەوەی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی ئاژەڵی هەروەها زیادبوونی گرفتی خۆراك لە جیهاندا لە دەرئەنجامی ناهاوسەنگی لە نێوان گەشەی دانیشتوان و گەشەی خۆراك. وایکردووە کە بایەخ و لێکۆڵینەوەی زیاتر بدرێتە دێ و نشینگە دێهاتیەکان و پلاندانانی داهاتوویی بۆیان.(١٧)

دێ نشینی ، بایەخ دەداتە لێکۆڵینەوەی نشینگەدێهاتیەکان لە خانەی جێنشینی بچووکی خێزان، تا دەگاتە کۆمەڵێك خانوو کە گوند پێك دەهێنن و کۆتاییشی دێت بە هەرێمی دێهاتی کە بریتیە لە کۆمەڵێك گوندو کۆمەڵگای جێنشینی لە دێهاتەکاندا، ئاخۆ لە رووی پێکهاتەو نەخشەی خانوو جۆری بیناکاری و دابەشبوونی، یا سروشتی پەیوەندی نێوانیان و لەگەڵ کۆمەڵگاکانی تردا.(١٨) بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چەند ئاراستەیەك هەیە لە لێکۆڵینەوەی نشینگە دێهاتیەکانداولە کاتێکدا هەندێك جوگرافیزان جەخت لەسەر خەسڵەت و تایبەتمەندی جیاکەرەوەی نشینگەکە دەکەن، هەندێکی تر بایەخی زیاتر بە پیشەدەدات، لەروانگەی ئەوەی کە رەنگدانەوەی جیاوازیە لە جۆرەکانی نشینگە، هەندێك جوگرافیزانی بەم دواییانەش بایەخیان داوە بە شێوەو پیشەو پەیدابوونی نشینگەکان.(١٩)

دەکرێ بڵێن، کە زۆربەی هەوڵەکان لە جوگرافیای نیشتەجێ بوون ئاراستەی بەرەو لێکۆڵینەوەی خانووی دێهاتی بووە لە رووی دابەشبوون و کەرەستەی بیناو بەتایبەتی سەبارەت بە جوگرافیزانە ئەڵمانەکان. چونکە نشینگە ئەڵمانییەکان بایەخێکی تایبەتی

لێکۆڵینەوەکانی میتزن A.Meitzen بۆ نشینگە ئەورووپییەکان. کە جەختی ۆرفۆلۆژیای گوند دەکردو لە کاتێکدا زۆربەی بایەخی فەرەنسییەکان لەسەر شێوەی خانووی دێهاتی و جۆری بیناکاری بوو.[20] لێکۆڵینەوەکانی دیمانجۆن A.Demangeon ئاراستەی بەرەو پێگەو پیشە و قەبارەی نشینگەکان ەرویشتوئەوفاکتەرانەی کە لە پشت ئەم جۆرە دابەشبوونە دەوەستن.

نشینگە بڵاوو و پەرتو بڵاوەکانیش پۆلێن کرانە سەر شێوەی هێڵی یا کە لەکەبوونی ەوەوی یا خانووێکی تاك. لە کاتێکدا لێکۆڵینەوەی تری هاوشێوە هەمان پێوەریان بەکارهێناوە، کە ئایا بۆ دیراسەتکردنی قەبارەو شێوەی نشینگەکان بێت یا پلەی چڕبوونەوەو وبڵاوبوونی وەکو هەوڵێك بۆ بەدەستهێنانی پۆلێنکارێکی هەرێمی جۆرەکانی دێ نشینی .

## رەهەندی مێژوویی دێ نشینی :

دێ نشینی قۆناغێکی گرنگی پێشکەوتنی کۆمەڵگا مرۆییەکانە چونکە نیشتە جێ بوونی مرۆڤ لە ژینگەیەکی دیاری کراوداو جێگیر بوونی تیایدا واتای خۆ گونجاندن بۆ ئەم ژینگەیە دەگەینی.هەروەها لە دەرەنجامی پەیوەست بوون بە زەویەوە وە بەرهەم هێنانی خواردن و جێگیر بوونی جۆرێك لە پەیوەندی کۆمەلایەتی ئابوری لە ناوچەکە دروست دەکات.[21]

کۆمەڵگا دانیشتوانیەکان لە جیهاندا، پەیدابوری بارودۆخ و کارتێکردنی نێوان دانیشتوان لەلایەکەوە و لە نێوان خۆیان و ژینگە سروتییەکەیە لەلایەکی ترەوەیە. ئەمەش وادەکات کە دانیشتوان کۆببنەوە لە ژینگەی تایبەتی وەکو شێوەیەك لە شێوەکانی ململانێ بۆ مانەوەو بەردەوام بوون. وا دەکات وێنەیەك لە وێنەکانی دابەشبوون پەیدابێت کە مرۆڤ لە شوێنێکی گونجاوتر بۆ خۆی و باروودۆخی کۆمەڵایەتی و ئابووری دابنێ. گەر نیشتەجێ بوونیش، دەربڕینێکی سەرەکی بەرەوپێش چوونی شارستان بێت کە کۆمەڵگا مرۆییەکان گەیشتوونە پێی، ئەوا قۆناغەکانی ئەو پێشکەوتنە چەند جۆرێك لە

جێنیشینی بە دەرخستووە کە بگونجێ لەگەڵ ئەم قۆناغانەو ئاستی شارستانی ئەو کۆمەڵگا مرۆییانە. ئاشکرایە کە نشینگە لادێیەکان، پەیدابوونی بەرەو پێشچوونێکە کە چەندین سەدەی دوورو درێژی پێ چووەو لەو کاتەوە چەندین گۆڕاوی سروشت و کۆمەڵایەتی و ئابووری کاریگەربوون. لە وێنەکێشانی شێوەکانی دابەشبوون و یا پلاندانانی چونکە ناکرێ گوند بەتەنها نیشتەجێ بوونێکی سەربەخۆ بێت. بەڵکو گوندەکان بەشێکن لە سیستەمی نیشتەجێ بوونی ئاڵۆز کە کۆمەڵێك گوند لە خۆ دەگرێ کە جیاوازن لە قەبارەو لە تۆڕێك یا چەند تۆڕێك ڕێکدەخرێن کە پەیوەندی شوێنیی تەواوی هەیەو شارەکان سەنتەری ئەم پەیوەندیانەیە.(٢٢) بۆیەش لێکۆڵینەوە دەربارەی نیشتەجێ بوون لادێی هیچ واتایێکی نابێت و بیانووی نابێتە وەکو پرۆگرامێکی زانستی، گەر ئەو گۆڕانانەی کە بەسەر هەرێمەکان دێت لە ڕووی شوێن و کاتدا بەیەکەوە بەهەند وەرنەگری.(٢٣) ئەو جۆرانەی کە ئەمڕۆکە دەبینین ناکرێ شیبکەینەوەو گۆڕانکارییەکانی بە دەربخەین بەپێی شارەزابوونی پاشکۆی مێژوویی بۆی.(٢٤)لێرەدا ئەستەمە لێکۆڵینەوەی نیشتەجێ بوونی مرۆیی بکەین بەپێی ناسینی ئەو بارودۆخەی کە یاوەری پرۆسەکانی نیشتەجێ بوون لە رابردوودا. بەتایبەتی ئەوەی کە لە قۆناغەکانی یەکەمی نیشتەجێ بوونی مرۆڤ ڕوویداوە.(٢٥) بۆیە سەیرنییە کە وتلزی ١٩٢٩ D.Wittlesey پێشنیاز بکات کە لەسەر بنچینەی مێژوویی لێکۆڵینەوە دەربارەی جوگرافیای مرۆیی هەرێمەکان بکرێت لە ژێر ناونیشانی بەدواداچوونی ئاوەدانی مرۆیی.(٢٦)

گوند بە کۆنترین سەنتەری نیشتە جێ بوونی مرۆڤ دادەنرێت لەسەر زەوی و لە هەموو جۆرەکانی تریی‌نیشتە جێ بوون بڵاوترە.مرۆڤ پاش ماوەیەکی دورو درێژ لە گەران و سوران بە دوای خواردەمەنی و ئاویا لە دوای ئارامی و حەسانەوە ناچار بوو جێگیر بێت. واش مەزەندە دەکرێت کە ئەم جێگیر بوونە پەیوەست بووە ، یەکەم جار بە ئەشکەوتەکان دواتریش شێوەی چەند خانوویەکی بچوکی پێکهێناوناسرا بەگوند.(٢٧) سەرەتایی پەیدابوونی گوند بۆ چەرخی بەردینی نوێ دەگەرێتەوە لە نێوان ماوەی

(۱۰۰۰۰_۷۰۰) پێش زاینی . کە مرۆڤ لە قۆناغی کۆکردنەوەو هەڵگرتنی خواردن ڕاوکردنی ئاژەڵ بۆ قۆناغی بەخێو کردنی ئاژەڵ و کشتو کاڵ هەنگاوی نا شارستانیەتیە کشتوکاڵیەکانیش پەیوەست بوونە بە پەیدابوونی گوند چونکە لە ڕاستیدا گوند یەکەم دیاردەی هاوکاری بوو لە نێوان دانیشتوان بۆ کارکردن و لە چالاکی کۆمەڵایەتی. مرۆڤ توانی لە چەرخی بەردینی کۆن یگونجێ لەگەڵ ژینگەکەی و ئەشکەوتوو سێبەرە بەردینەکان و هاوشێوەی بکاتە دالدەی. هەروەها مرۆڤی چەرخی بەردینی نوێ توانی یەکەم نشینگەی ناسراوی مێژوویی دروست بکات وەکو پێویستیەکی بارودۆخی ژیانی جێگری پەیوەست بە زەوی کشتوکاڵ[۲۸] بەڵام پەیدابوونی ئابووری کشتوکاڵی نوێی ئەوە ناگەیەنێ کە بەتەواوەتی جێنشینی ئەشکەوتی لەناو دابێت، کە تاوەکو ئێستاش لە هەندێك ناوچەی جیهان هەرماوە. بەڵام مرۆڤی چەرخی بەردینی نوێ توانی لە ڕێگەی زیادبوونی ژمارەی و پێویستی بوونی بۆ جێگری لەسەر زەوی و کێڵگەکەی کە بەردی بناغەی یەکەم بینای ئاوەدانکردنی دابنێ. دۆڵەکانی ڕافیدەین و دۆڵی نیل و دۆڵی ئەلسندو هەرێمی بەنجاب لە هیندستان یەکەم سەرهەڵدانی گوندی بەخۆوەبینی.[۲۹] لەوانەشە ئەم گوندانە ناوەکەی یەکەمی کە دواتر بەرەو پێشچوون ئەم جۆرە لە ئاوەدانی و دێی بۆ شار بوویێ. لەلایەکی ترەوە، ئوستڕالیا و نیوزیلەندەو هەردوو ئەمەریکا سەنتەری نیشتەجێ بوونی تازەنە لە پاڵ ئەو زەویانەی کە تازە ئاوەدان کراونەتەوە لە سیبریاو مەنشوریاو هەندێك پەراوێزی بیابان و زەلکاوەکان و بنار چیاکانی تازە نیشتەجێ بوو.

وا دیارە کە دێ نشینی بە چەند قۆناغێکی جیاوازی جێگیربوون تێپەڕیووەوتاوەکو ئێستاش رووبەرێکی فراوانی جیهان بە قۆناغە سەرەتاییەکانی ئەم جێگیربوونە تێپەڕ دەبێت.[۳۰] وا مەزەندە دەکرێ، کە ژمارەیەکی کەمی مرۆڤ جێنشین بوونە لە قۆناغە سەرەتاییەکانی جێگیربوون، ئەم حاڵەتەش کاتی بووە بۆیەش دابەش بوونی نیشنگەکان پەرشوبڵاوو بووە. ئەم جۆرەش لە جێگیربوون نەگۆڕدرا تاوەکو گۆڕانکاری هاتە دی لە

شێوازەکان کە گرنگترینیان بەرهەمهێنانی خۆراك بوو.[٣١] دەکرێ ئەو قۆناغەی کە مرۆڤ تیایدا هەوڵی بەرهەمهێنانی خواردنی داو دوای ئەویش مێژوویێکی جیاکەرەوەی ژیانی بێت. بەڵکو شۆڕشێکی راستەقینەی بەرەوپێشچوونی شارستانی لەوێ بێت. چونکە گۆران لە بەکاربردن خواردن بۆ بەرهەمهێنانی شێوازی بەکارهێنانی زەوی گۆڕی. هەروەها وێنەی دابەشبوونی کۆمەڵگا مرۆییەکان و شێوازی جێگیربوونیان و ئاوەدانی کردنی زەویان گۆڕی. .جگە لەوەی کە پەیدا کردنی خواردن چالاکیەکی سەرەکی گوند بوو ، بەلام پێویستی بوونی بۆ ئارامی و ئاسایش ودالدە shelte لەم چالاکیە هیچی کەمتر نەبوو. چونکە دالدە مرۆڤ دەپارێزێت لە دوژمنەکانی چ سروشت بێ یا مرۆڤ و حەوانەوە دابین دەکات، لە روانگەی ئەمەوە تێبینی دەکەین کە دابەش بوونی خانووەکان و بنیاتنانی تارادەیەکی زۆر پەیوەست بوو بە دەستەبەرکردنی ئاسایش و جێگیربوون لەلایەکەوە وجێبەجێ کردنی پێداویستە خۆراکیەکان لە لایەکی ترەوە. بۆیەش گرنگی خانوو لەوەدا ناودەستی کە دژالدەیەکی دانیشتوان دەستەبەر بکات بەڵکو هەروەها چالاکی ئابوری کشتوکالی و بەگەرخستنی زەوی . چونکە پەیوەندیکی بە هێز هەیە لە نیوان خەسلەتەکانی خانووی دێهاتیو جۆرەکانی لە گەل چالاکی کشتوکالی دانیشتوانی دێهات.

گومانیش لەوەدانیە کەوا درێژ بوونی ماوەی ئاوەدان کردنەوەی مرۆیی کاریگەری دیاری بەسەر قەبارەی سەنتەرەکانی نیشتەجێ بوون لادێی هەیە، چونکە زۆر جار ناوچە کۆنەکانی ئاوەدانی بەوە دەناسرێتەوە کە چری دانیشتوانی زۆرە و لادێیەکانی نزیکن لەیەکەوە بەپێچەوانەی ناوچە تازە ئاوەدان کراوەکان کە قەبارەی بچووکەو دورن لەیەکتری. دەتوانرێ تێبینی ئەم دیاردە بکەین بە ئاراستەی رۆژئاوای وڵاتە یەکگرتووەکان کە قەبارەی نشینگەکان بەرە بەرە بچووك دەبێتەوە تا دەگاتە پەری بەراریو بناری چیاکانی رۆکی هەروا لە ئوسترالیاش کە رەنگدانەوەی رەهەندی مێژوی جێگیر بوونی مرۆڤ و ئاوەدانکردنەوەیان لە ناوچەکە ئاشکرا دەکات.[٣٢]

ـگەیَ ئەوەش دا زۆرێك لە شارە كۆنەكان كە پێشووتر گوند بوون بەرەو نـەمان چـوون
ـ حوەتا لەبەر گۆرینی رێرەوی رووبارەكان یـاخود ئـەو گۆرانـەی بەسـەر بـارو دۆخـی
ـەعەوا داهاتووە لە وانەشە بە هۆی شەروو نەخۆشی وپەتا بووبیتـو هیـچی نـەماوە تـەنها
چەند شوێنەوارێك كە تاوەكو ئێـستاش پاشمـاوەی شـارەكانی تـر لـە بـەر چـاوو دیـارە.
ـلایەكی ترەوە ئەو گۆرانانەی كە لە بارودۆخی خۆجیەتی و ئەو شوێنەوارانەی كە جێـی
تێـێن لەلایـەن دانیـشتوان و خانووەكـان كاریگـەری خـۆی هەیـە. بەتایبـەتی لـە كـاتی
گۆرانەكانی رووداوە رامیارییەكان. دارمانی سیستەمێكی بەرپرس لە رێكخستنی ئاو و لـە
ێگای ئاودێری یا بە زل، دەرئەنجامی مەترسیداری لێی دەكەوێتەوە، چـونكە دەتـوانی بـە
ـت ناوچەی جیهان بگۆرێ بۆ ناوچەیەكی وشك و بریشك و بەكەڵك نایەت،(٣٣) جێـی
خۆشحاڵیە كە پێچەوانەكە راستە، چونكە پرۆژەكـانی چـاككردن و هەولـەكانی چـاكتر
ەكارهێنانی زەوی وا دەكـات كـە هـەر ناوچـەیەك بەكـەڵك بێـت بـۆ جێنـشینی چـرِی
دانیشتوانی زیاتر بكات.(٣٤) ئاشكراشە كە گواستنەوە لە ژیان گەرووكی بۆ جێگیربـوون
تازە نییە، چونكە هەندێك ماوە هەبوو كە هۆزە بەدەوییەكان و شـوانكارەكان باڵادەسـت
بوون و دواتر ماوەی تر هاتووە كە جێگەكانی جێنشینی فـراوانتر بـووە بـە تایبـەت دوای
پەیدابوونی دەسەڵاتدارێتی مەركەزی بەهێز و كاریگەری فاكتەرەكانی جێگیربوون.(٣٥)

## سەرچاوەو پەراوێزی بەشی یەکەم


١-M.E.Mc Gouh, Ageographyof population and Settlement, foundation of geography series, W.C. Brown company U.S.A, ١٩٧٠.

٢-A.K.PhilbrickThisHumanworld,JpojohnWileyandsonsInc.NewYork, ١٩٦٣, p١-٦

٣- محمد علي الفرا، مناهج البحث في الجغرافيا بالوسائل الكمية، الكويت، ط٢. ١٩٧٥،ص ٥٢-٥٣.

٤- بروانة : صلاح الدين الشامي، الجغرافيا دعامة التخطيط، منشاءة المعارف ، الاسكندرية ،١٩٧٦.

٥- بروانه :

ا- خليل اسماعيل محمد، انماط الاستيطان الريفي في العراق،مطبعة الحوادث، ١٩٨٢،بغداد،ص٣-٥.

ب- عبد الفتاح محمد وهيبة ، في جغرافية العمران ،دار النهضة العربية. بيروت،١٩٧٣، ص ١٠

٦- بروانه:.H.D. Clout ; Rural Geography, Oxford, Pergamon press. ١٩٧٢

٧- M. Chisholm, Rural Settlement and Landuse, London, ١٩٦٢.

٨- R.U.Cook and J.H.Jonhnsin, Trends in Geography an Introductory survey pergamon press, Oxford, ١٩٦٩,p.١٢٣

هـەروەها: H.D.Clout, Rural geography an Introductory survey pergamon,Oxford,١٩٧٧,p.١

٩- محمد الجوهري ، علم الاجتماع الريفي والحضري، دار المعارف ، ١٩٨٠،ص٢٤.

١٠- عبد الفتاح محمد وهيبة ، مصدر سابق، ص٢٨.

١١- محمد حجازي ، جغرافية الارياف ،دار الفكر العربي ،الكويت، ١٩٨٢،ص١٦٦.

١٢- بروانه: الفرا،المصدر السابق،ص ٣٨

١٣- E.Jones; Human Geography chatto and windusK١٩٦٤

١٤- Cook and Johnson: Op.Cit, p.١٢٣

١٥- بروانـە كتيبـە كـەى بەفەرەنسى La Geographic de I. Habitat Rural Annde Geography .١٩٢٧

لـە: R.E.Dickinson ; The Maker of modern Geography , Routledge, London , ١٩٦٩, p.٢٣٤

Rural Settlement and Land use *له كتيبى:
Planning studies in Rural Areas **
Planning and the rural Environment ***
**** لەو لیکۆلینەوانە:

a- M.E.Mc. Gouh ; Geography of population and settlement (١٩٧٠), Settlement patterns, (١٩٧٩)

b- F.S. Hudson ; Geography of settlement (١٩٧٦),

c- J.A.Everson F. Gerald ;wold bank; Rural Development policies (١٩٧٦)

***** لەو لیکۆلینەوانە:

a- Clout; Rural Geography an Introductory servey

b- R.L.Sing K.Sing ; Reading in Rural settlement .

c- Reading in Rural settlemen

d- a.r.baker; The Geography Rural settlement

١٦- بروانە: عبدالرزاق عباس ، الاطار النظرى للجغرافيا،مطبعة اسعد،بغداد، ص١٢٤ .

****** لەو لیکۆلینەوانە:

-S.A.Kovlev; problems in the rural settlement .١٩٦٨.

- V.S.Ryazanov;Paths of erolntion of rural Settlement,١٩٦٨.

x لەوانە :

a-Financing Rural Housing (١٩٧٤)

b-Self-help practice in housing Settlement(١٩٧٣)

c- Human settlement performance standard (١٩٧٧)

xx لەو لیکۆلینەوانە:

١- خليل اسماعيل محمد، انماط الاستيطان الريفي في العراق،مطبعة الحوادث ،بغداد،١٩٨٣.
٢- احمد حسين الدليمي،اهمية كفاءة مراكز الاستيطان الريفي في تخطيط التنمية الريفية المتكاملة،رسالة ماجستير،مركز التخطيط الحضري والاقليمي ،جامعة بغداد،بغداد ، ١٩٨٤.
٣- نبيل عبدالقادر،النمط الحالي لتوزيع المستوطنات الريفية والخطة المكانية المقترحة للاستيطان الريفي في محافظة القادسية،رسالة ماجستير،مركز التخطيط الحضري والاقليمي ،جامعة بغداد،بغداد ، ١٩٨٤.
٤- نعمان حسين الجبوري،تخطيط المستوطنات الريفية في الاقاليم الثانوية،رسالة ماجستير،مركز التخطيط الحضري والاقليمي ،جامعة بغداد،بغداد ،١٩٨٥.
٥- احمدطه شهاب الجبوري،الاستيطان الريفي في قضاء الحويجة،رسالة ماجستير،كلية الاداب،جامعة بغداد،١٩٨٧
٦- عايد سلوم الحربي، اثرالتنمية الريفية في التباين المكاني للاستيطان الريفي في محافظة بابل،رسالة ماجستير،كلية الاداب،جامعة بغداد،١٩٨٨
٧- محمد شرتوح الرحبي، كفاءة التوزيع المكاني لمراكز الاستيطان في محافظة نينوى .رسالة دكتورا،كلية الاداب،جامعة بغداد،١٩٩٠
٨- فريد شمعون ايشوكيشي،تحليل بنية هيكل الاستيطان الريفي،رسالة ماجستير،مركز التخطيط الحضري والاقليمي،بغداد ،كانون الاول،١٩٩٠
٩- حبيب راضي الدليمي، خصائص الاستيطان الريفي في محافظة واسط وعلاقتها بالمسافة، رسالة دكتورا،كلية التربية(ابن رشد)،جامعة بغداد،١٩٩٥
١٠- محمد عبدا لله عمر اللهوني، التحليل الجغرافي للاستيطان الريفي في إقليم كوردستان العراق دراسة تطبيقية لمحافظة اربيل، اطروحة دكتوراة جامعة صلاح الدين، اربيل،٢٠٠٢
١١- ايوب خليل اسماعيل.مورفولوجية القرية في الاقليم الجبلي(دراسة ميدانية في محافظة اربيل)،رسالة ماجستير،كلية الاداب،جامعة صلاح الدين،اربيل،٢٠٠٣
١٢- رۆستەم سەلام عەزیز،دابەش بوونی جوگرافی نشینگە گوندیەکان لە قەزای کۆیە وکاریگەری لەسەر کرداری پەرەپێدان ،نامەی ماستەر،زانکۆی کۆیە،کۆلێجی پەروەردە،٢٠٠٦
١٣- ئەحمەد محمەد سالح،شیکردنەوەیکی جوگرافی دابەشبوونی نشینگە دێهاتیەکان لە قەزای شارباژێردا،نامەی ماستەر،کۆلیجی زانستە مرۆڤایەتیەکان،زانکۆی سلێمانی،٢٠٠٦
١٧- Clout; Op.Cit,p.٢٢٢-٢٣٢
١٨- محمد عبدالهادي دكلة وزملاؤه، المجتمع الريفي ،١٩٧٩، ص١٤٥.
١٩- Cook,Johonson;Op.cit,p.١٢٤
٢٠- Ibid:p.١٢٤
٢١- بروانە:

Holling Shead;Human Geography ,In leeA.M.ed,principibles of sociology Barnes and Noble, ١٩٤٦,p.٦٤-٩٢

٢٢- بروانه:عبدالرزاق البطيحي ،جغرافية الريف. بغداد،١٩٨٢،ص١٥١.

٢٣- حجازى ، المصدر السابق،ص٢٠٠.

٢٤- المصدر نفسه، ص٩٨٩.

٢٥- المصدر نفسه، ص٧٩.

٢٦- عبد الرزاق عباس، المصدر السابق،ص٢٣.

٢٧- عبد الباقى زيدان ؛ علم الاجتماع الريفى والقرى المصرية؛ مطبعة المعرفة؛ القاهرة. ١٩٧٤؛ ص ١٩.

٢٨- هاوكس وولى، اضواء على العصر الحجرى الحديث ، بيروت، ص٣١.

٢٩- بروانه: محمد السيد غلاب، البيئة والمجتمع؛ ط٣، مكتبة الانجلو المصرية،القاهرة؛١٩٧٥،ص٤٠٠-٤٠١

٣٠- حجازى ، المصدر السابق، ص٧٧.

٣١- المصدر نفسه ،ص٨٤.

٣٢- المصدر نفسه ؛ص١٦٦ .

٣٣- كارنيه، جغرافية السكان؛ ترجمة حسن الخياط ومكى محمد عزيز، مطبعة العانى، بغداد، ١٩٧٤ ،ص؛٩٠.

٣٤- خليل اسماعيل محمد؛ المصدر السابق،ص٢٣.

٣٥- د.لوس، انماط سكانية متغيرة،منشورات مركز دراسات الخليج العربى. جامعة البصرة؛ ١٩٧٨،ص١٨.

## بەشی دووەم

## شێوەو مۆرفۆلۆژیای نشینگە دێها تیەکان

### مۆرفۆلۆژیای خانووی دێهاتی : -

لێکۆڵینەوە دەربارەی مۆرفۆلۆژیای گوند دووئاراستەی هەیە : یەکەمیان تایبەتە بە شێوەی گوندو پێکهاتەی و درێژبوونەوەی خانووەکانی و دووەمیش تایبەتە بە نەخشەی خانووی دێهاتی و پێکهاتەی بیناکاری . لە ژێر رۆشنایی ئەمە بایەخدانی ئەم لێکۆڵینەوەیە بەشێوەی گشتی سەنتەری جێنشینی و ئەو پێشکەوتنانەی بەدەست هاتوون لەبارەی بینا یا نەخشەسازی یا فراوانبوونی بیناکاری لە خۆدەگرێت .کەئەمەش دەربڕینێکی ڕاستیگەریە لە نێوان شێوەی گشتی خانوو سروشتی ئەو پیشەی کە پێشکەشی دەکات .[1]

خانووی دێهاتی جیاوازە لە رووی رووبەرو شێوەی، هەروەك جیاوازیشە لە جۆرو کەرەسەی بیناکاری. هەندێکی سادەو ساکارە و هەندێکی تری رێك و پلاندانراوە، هەروەها زۆربەی یەك نهۆمیەو کەمێکی نەبێ دوونهۆمیە .بێ لەو خانووانەش لە قوڕو گڵ دروست کراوەو هەندێکی لە کەرپوچ و بەردو هەندێکی تریش لە قامیش ورووەکی بەردی.

متزن توانی لە لێکۆلینەوەکەی دەربارەی دێ نشینی لە ئەوروپا جۆری کۆکراوەو بلاَووە بووی جێنشینی جیا بکاتەوە ،لە کاتێکدا لێکۆڵینەوەی (دیمانجون ) ی فەرەنسی بایەخی بە شێوەی خانووەکانی دێهاتی داو لەگەڵ کەرەستەی بیناکاری .[2] ئاشکرایە ئەو گۆرانانەی بەسەر شێوەو پێکهاتەی دێهاتی ئەوروپی هاتە دی، لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم بە شێوەییکی خێراو قووڵ بوو بەتایبەتی لەلایەنی هۆیەکانی گواستنەوەو گەیاندن، کەئەمەش بووە مایەی شاردنەوەی زۆربەی دیاریدە ڕەسەنەکانی ، هەروەها ئەمەش لە زۆرێك لە ولاَتانی عەرەبی تێبینی دەکرێ .

جۆری بڵاوەبوونی خانوو : بایەخدان بەنشینگە دێهاتیەکان و خانووەکانی بێ گومان دەبێتە مایەی لێکۆڵینەوە لە جۆری دابەشبوون و بڵاوەبوونی ،بەو پێیەی کە وێنە راستی ئەو بارودۆخەی کە کاری کردۆتە سەر وێنەکێشانی ئاشکرا کرد.

جوگرافیزانەکانیش بایەخ ئەدەنە زانینی ئەو پەیوەندیەی کەلە نێوان ژینگەی سرووشتی و جۆری بەکارهێنانی زەوی و ژیانی کۆمەڵایەتی باوو لەلایەك ، لەگەڵ ئەو تەرزەی کەخانووەکان دەیگرێتە خۆو لەکاتی دابەش بوونی لەلایەکی ترەوە .[٣] وەکو چۆنیش گوندەکان جیاوازن لەڕووی قەبارەوە ئەوهاش جیاوازن لە رووی شێوەی درێژبوونەوەی خانووەکانی. هەندێك لەو گوندانە شێوەی ئەندازەیی رێك وەردەگرن کەرەنگدانەوەی بەهای زەوی کشتوکاڵیەوە پارێزگاری خەڵکەکەی بۆ بە فیرۆ نەدانی بەمەبەستی خانوو کردن لەنێوان ئەم کوندانەدا. هەندێکی شێوەیکی هێلکاری وەردەگرێ کەخانووەکانی بەدرێژایی رێگاوبان یاخود رێچکە ئاوییەکاندا دەڕوات، لەکاتێکدا خانووی دێهاتی لەهەندێك هەرێمەکان پەرتووبڵاو دەبن و جۆری بڵاووەو پەرشوو بڵاو پێك دێنن. لە هەندێك هەرێمی تر نزیك دەبێتەوە و یالەپاڵ یەکدا دەبێ و جۆری کۆکراوە یا جەنجاڵ (متكتل) وەردەگرێ . دەکرێ بلێین کەجۆری دابەشبوون و بڵاوە بوونی خانووی دێهاتی جیاوازە لە شوێنێکەوە بۆ ئەوی تر، بەپێی جیاوازی فاکتەرە پەیوەندارەکان و رۆلیان لە ئاراستە کردن و دیار کردنی شوێنی گوندەکان و دابەشبوونی خانووەکان .

نیشتە جێبوونی کۆکراوە،شێوەیکی کۆبوونەوەی دانیشتوانە گەر پێویستیان بە هاوکاری کۆمەڵ هەبێت. بۆیەش گوندی کۆکراوە کۆنترین سەنتەری نیشتە جێی ناسراوە لەلایەن مرۆڤەوە لە دۆڵەکانی ناوچەی نیشتمانی عەرەبی ئەمەش لەچەرخە کۆنەکانی پێش مێژووەوە .[٤] بڕوانە وێنەی ژمارە (١) .

وێنەی ژمارە ( ١ )

خانووی دێهاتی کۆوەبوو



ڕووداوە مێژوویەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە کۆچەرە یەکەمەکانی جیهانی تازە لە گوندی کۆکراوە جێنشین بوون، چونکەلەم کۆبوونەوەدا ئارامی و ئاسایشیان بەدی کرد .لەگەڵ زیاد بوونی توانای مرۆڤیش ،شێوازی نوێی بەگەر خستنی زەوی هاتەکایەوە و بە شێوەییکی باشتر ،ئەمەش بووە جیابوونەوە لە کۆمەڵ و پەیدا بوونی خانووی پەرشوو بلاو.ناکرێ هۆی جۆرەکانی خانووی دێهاتی بۆ یەك فاکتەر بگەڕێنینەوە، جوگرافیزانیش بۆ ئەوەی بگاتە هۆکاری سەرهەڵدانی ئەم جۆرانە دەبێ شارەزای کۆمەڵێك فاکتەری سروشتی و ئابووری و مێژووی بێت . شتێکی بەسوودیشە گەر ئەم فاکتەرانە بخەینە روو بۆ بەدیار خستنی رۆڵی هەریەکەیان لەدابەشبوونی شوێنی خانووی دێهاتی:

١ – فاکتەرە سروشتیەکان :

کاریگەری ئەم فاکتەرانە بە ئاشکرا دیارە بەسەر شێوەی درێژبوونەوەی خانووی دێهاتی وێنەی دابەشبوونی، چونکە هەبوونی بەرزاییك یا زەڵکاوێك دەبێتە مایەی

دیاریکردنی شێوەی فراوانبوونی گوندەکە و ئاراستەییکی دیاریکراوی بۆ دەخاتەروو. هەروەها هەبونی رووبارێك یا رێگایەك زۆربەی جار کۆنترۆلی ئاراستەی گەشەکردنی دەکات. گوندەکانی چیاو دوورگەکان، بەوە جیا دەکرێتەوە کەدرێژبوونەوەیان سنووردارە لەهەموولایەکەوە بۆیەش پالەپەستۆی خەستووتە رووبەرێکی دیاری کراو . بۆیەش پێگەی نشینگە کاریگەریەکی زۆری هەیە بەسەر دیاری کردنی شێوەو جۆری درێژ بوونەوەی خانووی دێهاتی، گەر بێتوو لە دۆلێك بنیاتنرا کە چیایی زۆر لێژی هەبوو بە شێوەی هێلکاری درێژ دەبێتەوە بەئاراستەی دۆلەکە . شتێکی سروشتیە کەجیاوازی هەبێت لە کاتی هەلبژاردنی پێگەییکی خانوو لە زەوییکی تەخت لەگەل هەلبژاردنی لە زەوی یەکی دژوارو سەخت . چونکە ئەوەی بۆ یەکەم پێویستە لەکاتی ئاوەدانکردنی جیاوازە لەوەی دووەم ئەم جیاوازیەش بە شێوەییکی یەکلا بە دیاردەکەوێت لە رێگەی جیاوازی جێگیری و جێنشینی بەیەکبەستراوو پەیوەستدار رلە زەوی تەختدا ، لەگەل شێوەییکی تری پەرشوو بلاو دابراوو لەزەوی سەخت و دژوار . هەروەها دیاردەی سروشتی هەیەکە هانی کۆبوونەوە لە گوندی گەورەو کەلەکەبوو نادات و وادەکات دانیشتوانی لە نشینگەی بچووك و دابراو بژین لەوانەش کەمی سەرچاوەکانی ئاوو زۆری زەلکاوەکان و چربوونی دارستانەکان .

دابەشبوونی گوند لە ناوچەی چیایی، بەوە جیا دەکرێتەوە کەلە جۆری کۆکراوەیە و کەم جار خانووی چیایی دوور دەبێتەوە لە گوندەکەی . خانووەکانیش زیاتر جەنجال دەبن لە ناوچە سەختەکان کە رووبەری تەختایی کەمترە و دەشتی بچووکە . فاکتەرەکانی ئاسایش و ئارامی رۆلێکی باشی هەیە لە پەیدا بوونی گوندی گەورە لە چیاکاندا، هەروەکو ولاتانی دەریای ناوەراست کە گوندەکە لە بنارچیاییك بینا دەکرێ دوور لە زەوی یە کشتوکالیەکەو لەوانەشە کۆبونەوەی زیاتر بیت لە ناوچیاکاندا .

سەرچاوەکانی ئاویش رۆلی گرنگیان هەیە لە دیاریکردنی کۆکراوەیی و بلاووە بوونی دێ نشینی بە تایبەتی لەناوچەکانی ووشك و کەم ئاوو کە پێویست بوون بۆ ئاوو

وادەکات کۆببنەوە لە دەوری یا نزیکی ، دیارترین نموونەی ئەمەش دیاردەی واحاتە لە بیابانەکان لە کاتێکدا هەلی بلاووە بوون بەردەستە بۆ نشینگەکانی ناوچە شێدارەکان .

شێوەی درێژبوونەوەی خانوو دێهاتی جیاوازە لە ناوچەکانی ئاوی ژێر زەوی و ئەوانەی پشت بە ئاوی باران و ئاوی سەر زەوی دەبەستن . وادیارە کەخانووەکان کۆ دەبنەوە بە گشتی لەو ناوچانەی کە بارانی کەمە لە دەوری بیرو کاریزو کانیاوسەرچاوە ئاوییەکان و قەبارەی دانیشتوانیش پشت بە رادەی ئاوی بەردەست دەبەستێ لە پاڵ توانای کشتوکاڵی زەوی. هەروەها لەوانەیە بلاّووی ڕووبارەکان و زۆری لقەکانی ببێتە مایەی پەیدا بوونی خانووی پەرشوو بلاّو . لە هەر شوێنیکیش زۆنگ و زەلکاوەکان بلاووبن ، پێویستی بوون بۆ زەوی ووشك بایەخداردەبێ بۆ بنیاتنانی خانوو، دانیشتوان ناچار دەکات بە دوای دورگەی سروشتی هەندێ بەرزبگەڕێن کە مەبەستیان بەرزکردنەوەیتی بە قوڕو قامیش وبەردو گژووگیای زەلکاوی تر. یا ئەوەتا دورگەی دەستکردی تایبەت دروست دەکەن کە ئەمەش وادەکات سەنتەری جێنشینی تایبەتی سەرهەلّبدات کە خانووەکانی نزیك یەکترن ،هەروەها هەندێك کۆمەلّی جێنشینی بچووك و دوور لە یەك هەنە لە پەراوێزی زۆنگ و زەلکاوەکان و لە وانەشە لەناوەڕاستی.

لەژێرڕۆشنای ئەوی ووترا جیاوا زی ئاشکرا هەیە لە جۆری دابەشبوونی خانووی دێهاتی لە ناوچەی چیایی لەوەی لە ناوچەی دەشتایی یا تەخت هەیە .گومانیش نیە کە پێگەی دەشتایی بە تواناترە لە بارەی لە خۆوگرتن کۆمەلّی گەورەی خانوو کە بگونجێ لەگەلّ بەر دەستکردنی زەوی بۆ کشتوکالکردن و جێنشێنی، لە کاتێکدا کۆبونەوەی فراوان شتێکی ئەستەمە لە ناوچە شاخاویەکان یا لە ناوچەی زۆنگ و زەلکاوەکان

٢- فاکتەرە ئابووریەکان :

سیستەمی کشتوکالکردن و جۆری بەرووبووم لەپاڵ شێوازی بەگەرخستنی زەوی و دامەزراوە کشتوکالّیەکان، بەشێوەیکی گەورە پەیوەندی بە جۆری دابەشبوونی

خانوەکان هەیە هەروەك کاریگەری ڕاستەو خۆی هەیە بەسەر جۆری دابەشبوونی نشینگە دێهاتیەکان.[٥] گوندەکانیش جیاوازن لەڕووی ژمارەی دانیشتوانی، بەپێی دەرامەتی خۆمالی و توانای مرۆڤ لەسەر بەکارهێنانی .لە گوندەکانی ژینگە کەم دەرامەتەکان لە پەراوێزی بیابانەکان ژمارەی خانووەکان زیاتر نیە لە چەند خانوویەك، لەکاتێکدا ژمارەکە بەرز دەبێتەوە لەو هەرێمانەی کەدەکەوێتە سەرزەوی کشتوکالّی خانووەکانی زیاتر نزیك دەبن لەبەردەورەدانی بە کێلگەکان کەوا دەکات فراوان بوونی سنوور داربێت ، لە کاتێکدا خانووەکان درێژدەبنەوە لە شوێنە کراوەکان هەروەها دابەشبوونی زەوی و بەکرێدانی لەلایەن جووتیاران ، یارمەتی پەیدا بوونی سیستەمی کێلگەی کراوە دەدات OPEN FIELD SYSTEM کەناهێلێ دیاریدەی خانووی پەرتووبلاّو پەیدا بێ ، بەتایبەتی لەناوچەکانی دێمەکار . لەکاتێکدا پەنا بۆ جێنشینی کۆکراوە دەبردرێ لەناوچەی ئاودێری کە مولّکداریەتی فراوانی هەیە بەتایبەتی لە ژێر سیستەمی هۆزایەتی . بۆ کشتوکالّی چڕو پڕ ، سەرکەوتووترین شێوازە کە جووتیارانپەیرەویان کردبێ بۆ بەکارهێنانی زەوی و پشت بەست بەو ژمارەییکی زۆری جووتیاران دەژیان و لە گوندی گەورە کۆبوونەوەو کەلەوانەیە لەسەرەتادا دووربوون لەیەك بەلام ئەوەندەی نەبرد نزیك بوونەوە لەدەرئەنجامی قەرەبالەغ بوونی گوندەکان بە دانیشتوان و دواتر ئارەزووی هەندێکیان لەگەران بە دوای بوارێکی فراوانتر تاوەکو گوندی بچووك پەیدا بوو کەئەویش ئەوەندەی پێ نەچوو قەبارەی گەورە بوو ، بۆیەش گوندی گەورە بلاوو بووە لە باشووری روسیاو لە بەریتانیا لە پێش سەدەی حەڤدەهەملە ئاوەلێژی باریش لەسەدەکانی دوازدەم و سێزدەم هەروەها لە نیو ئینگلاندو رۆژئاوای ئەمەریکی ئەم جۆرە گوندانەش بە شێوەیەکی فراوان پەیدا لەسەرزەوی شارستانیەتە کشتوکالیە کۆنەکان لە عێراق و میسرو هیندستان و چین . تائێستاش زۆربەی دانیشتوانی ئەم وولاتانە لەگوندی گەورە دەژین و گشتوکالی چڕۆپڕ ئەنجام دەدەن.[٦]

ئـەو زەوی یانـەی کـە کـشتوکاڵی چـڕووپڕی تیـدا دەکـرێ، لەوانـەش چـاندنی سەوزەوات و میوەجات و پەموو و برنج .بەوە دەناسرێت کە چـڕی دانیـشتوانی بـەرزە، لەبەر هەمەجۆری پرۆسەکانی کشتوکاڵی کە پێویستیەتی و ئەسـتەمی بـەکارهێنانی ئـامێر تیایدا . لە کاتێکدا چڕی نزم دەبێتەوە لەو زەویانەی کەکـشتوکاڵی دانەوێڵـەی تێدایـە، بەتایبەتی گەنم و جۆ. چونکە لە جۆری کشتوکاڵی فـراوانن کـە دەسـتی کـارەی زۆری ناوێت بەتایبەتی لە دوای بەکارهێنانی ئامێر لە پرۆسـە کـشتوکالیەکان . بۆیـەش جـۆری یەکەم لە چڕی یارمەتی پەیـدا بـوونی جـۆری کـۆکراوەی خـانووی دێهـاتی دەدات لـە کاتێکدا بەگەڕخستنی ئاسۆیی زەوی کشتوکاڵی یارمەتی بلاَووەبونی خانووی جووتیـاران دەدات بەسەر زەوییەکـی فـراوان و بـە جـۆرێکی لەیـەك دوور. لـە پـاڵ ئەمـەش کـەمی هۆیەکانی گواستنەوەو ئەستەمی پەیوەندی کردنی جووتیار بە کێڵگەی وای کردووە کـە جۆری تـاك یاپەرشـوو بـلاوی خـانوو پەیـدابێت ، کـە جووتیـار ناچـاربووە لـە نزیـك کێڵگەکەی جێگیر ببێت . هـەروەها پەیـدابوونی خـانوو لـە کۆتـایی کێڵگـەی شـریتی یالاکێـشەیی لەتەنیـشت ڕێگایـەك یـا کـەناڵێکی ئـاوی یالەتەنیـشت کێڵگەکـەی و لـە پەراوێزی ناوچەی دارستان هەندێك جار.... وای کردووە جۆری پەرشوو بلاوی خـانوو دروست بێ، لەوانەشە خانووەکـان کۆببنـەوە بۆبەردەسـت کردنـی زەوی پێویـست بـۆ کشتوکاڵکردن ولەکاتێکـدا ڕێگایـەك پەیـدابێ کـە گوندەکـە بـەدەورو پـشتی ببەسـتێ ،وادەکات خانووەکان بۆخۆی رابکێشێ بە درێژایی ڕێـڕەوی هـەردوولادا و شـێوەییکی هێلکاری جیا کەرەوەی پێ ی ببەخشێ. ئەمەش بەدرێژایی ڕێگای ناوچـەی کـەناری لـە جەزائیر دا تێبینی دەکرێ.(٧) دۆڵەکانی حەزرە مووت لە باشووری دوورگەی عـەرەبی ، نموونەییکی ترە بۆ پاراسـتنی زەوی کـشتوکاڵی، چـونکە دانیـشتوانی ناچـار بوونـە کـە خانووەبچووکەکانیان بە شێوەییکی لـە پـاڵ یـەك دروسـت بکـەن، لـە پـەراوێزی زەوی کشتوکاڵی و راستەوخۆ لە پاڵ دۆڵە بەرزەکانیش. ئەمەش وای کـردووە فـراوان بـوونی

تەنها ڕێگە چارە بێت بۆ زیادکردنی ژمارەی خانووەکانیان بۆیەش خانووی چەند هەرزوو لێرە پەیدا بوو.[٨]

جێنشینی لە گوندی کـۆکراوە بەتـەنها پێویـستی جووتیـاران نیـە، چـونکە لـە کـاتی لێکۆڵینەوە لە کۆمەڵگای غەیرە کشتوکاڵیەکان ، وادەرکـەوت کـە ئاراسـتەیان بـەرەو جێنشینی لە گوندی کۆکراوەیـە. ئەمـەش لەبـەر ئاسـانکاری هەڵـسوورانی پیـشەکەیان بەباشترین شێوە وەکو ڕاوکەرانی ماسی و خواردن کۆکردنـەوە لـە هیندیـە سـوورەکانی باکووری کالیفۆرنیا .

٣ – فاکتەرە کۆمەڵایتیەکان : –

فاکتەرە کۆمەڵایتیەکان ڕۆلێکی گرنگی هەیە لە دیاریکردنی شێوەی گونـدو جـۆری درێژ بوونەوەی خانووەکـان . زۆر جـاریش پەیوەندیـە هۆزایەتیـەکان وادەکـەن گونـدی کۆکراوە پەیدا بیێ بۆ وەدەست هێنانی ئارامی و خێرو بێـری هاوبـەش . کەتائێـستاکەش کۆمەلە سەرەتایەکان لە ژیانی بەکۆمەڵ دەژین لە سەنتەری جـێگیری گـەورە ،هـەروەکو کۆمەڵی ئەل بۆرو لەدۆلی ڕووباری ئەمەزۆن ، هندیە سوورەکان لە باکووری ڕۆژئـاوای ئەمەریکای باشوور، کە خانووەکانیان لێك نزیك و بەیەکبەسـتراوون و شـێوەی گونـدی بەیەکەوە بەسـتراوو پێـك دێـنن .لەگـەڵ ئەوەشـدا ئـەم جـۆرە پەیوەندیـە بـەس نیـە بـۆ کۆکردنەوەی دانیشتوان لە گوندی کۆکراووەو گەورە . چونکە زۆرجـار داب ونـەریتی کۆمەڵگا بایەخدارتر دەبێت و جۆری کۆمەڵگا جێنـشینەکان لەوانەیـە درێژبوونـەوەییکی بەستراوە هۆزایەتیەکان بێت .

لەوانەشە ڕێکخستنی خانوو، خۆشی ڕەنگدانەوەیکی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی بێت لەرووی شوێنی میوانداری وجۆری ژوورەکان یا دابەشبوون و قەبارەی خانوو ئەو خزمەتانەی کە پیشکەشی خێزانەکە دەکات .[٩] سەیریش نیە هۆکاری فاکتەری کۆمەڵایەتی هەروەکو ئۆرسۆ دەبینێ بەهێزترە لەهۆکاری سروشتی لەوولاتە تازەپێگەیشتووەکان .[١٠]

هەستی کۆمەڵایەتی نێوان کـشتیاران وئـارەزووی هۆزایـەتی پێکـەوە ژیـانی خێـزان و کۆکردنـــــەوەیان کاریگــــەری هەیلەپەیـــــدابوونی کۆمەڵگاجێنــــــشینەگەورەکان .لەوانەشەچـــەندخێزانێك کۆببنـــەوە کەپەیوەنـــدی خزمایـــەتیان نـــەبێت و یـــەکگرتنیان یەکگرتنێکی خزمایەتی نەبێت بەڵکو رامیاری بێت، لەگـەڵ ئـەوەی شـێوەی کـۆکراوەی یەکە جێنشینیەکان سەرەتایی و کۆنە و بە کەڵکی نیشتەجێبون نا بێ گەرژیانی کۆمەڵگای ئابووری بەرەوپێش چوو. بـەڵام تاوەکوئێـستاش هەنـدیکیان هـەر شـێوەی کـۆنی مـاوە، ئەمەش دەگرێتەوە بۆ ئەوەی کـە گونـد یەکـەیکی کۆمەڵایتیـە پـێش ئـەوەی یەکـەیکی جێنشینی بێت وپەیوەندی هەمە جۆرو بەیەکبەستنەوەی هاوبەش لە نێوان دانیشتوانی هەیە .لەهەر شوێنێکیش ئەم پەیوەندیانە لاوازبوو بـارودۆخی ئـابووری گـۆڕا ،وادەکـات کـە ژیانی بە کۆمەڵ لاوازبێت و جۆری جێنشین لە گوندی کۆکراوە بەرەو جێنشینی پەرشوو بلاو دەگۆڕێ. ئەم شـێوە گۆڕانـەش لـە ئـەوروپا پەیـدا بـوو بەتایبـەتی لـە فەرەنـسا و ئینگلتراو ئەلمانیا، دواتر لە ئیتالیا و سویسرا هـەروەها لەیـەکێتی سـۆڤییەت و کەنـەداو وولایەتە یەکگرتووەکان . وابێ دەچێت کە سیستەمی کۆکراوەی کەلەمەوپێش ئامـاژەی پێکرا ، بەرەو لەناوچوون چوو سیستەمی کێلگەی پـەرژینکراو ENCLOSUURE SESTEMشوێنی گرتەوە.[11] ئەم گۆڕانەش ڕەهەندێکی دووری هەبوولە بـەریتانیا . چونکە بووە مایەی کۆچ کردنی زۆرێك لە جووتیاران بـۆ ئـیش کـردن لـە تونیلـەکانی خەلووزو کارگەکان بەتایبەتی لە دوای شۆرشی پیشە سازی بەپێی ئەمەش ئەو بۆچوونەی کە دەلێ بلاووبوونەوەی جێنشینی شێوەیەکە لە شـێوەکانی ئـازادی لەوانەیـە راسـتییکی زۆری تێدابێ .لـە کاتێکـدا گونـدی کـۆکراوە واتـای کـەمی توانـای مـرۆڤ و لاوازی ئامرازەکانی وملکەچی بۆ داب و نەریتی باپیرانیەتی .

جۆری کۆەبوو لەناوچە دژوارەکانی دێهاتی جەزائیری دیارە بەتایبەتی گوندە کۆنەکانی کەنیـشانەی ڕابـردووی پێوەدیـارە و ڕەنگدانـەوەی بـارودۆخی سروشـتی وپەیوەندیـە

کۆمەلایەتیەکانە کەپێویستی بە کۆبوونـەوە چـڕبوونەوەی دانیـشتوانە .[١٢] هـەروەك لـە بەرزایەکانی بەلقان و لوبنان و ئیران بەدی دەکری.

٤ – فاکتەرە مێژووییەکان :

دەکـریٚ شـارەزای کاریگەریـە مێژوویـیـەکان بـبین بەسـەر جـۆری دابەشـبوون و بلاوبونەوەی خانووی دێهاتی ، ئەمەش لـە ڕێگـەی ئـەو ڕووداوانـەی کـە ڕووبـەڕووی ناوچەکە یا هەرێمەکە بۆتەوە و ڕێگاکانی بەرەنگار بوونەوەی. دانیشتوانی ئەو ناوچـەیەش خانووەکانیان دوورلە ڕێگا گشتی یەکان و شوێنە کراوەکـان بنیـات دەنیـێن لـە ترسـی هێرشی خەلکانی تر لە کاتی ئارامیش نشینگەکان بلاوو دەبنەوە لە نزیك سەرچـاوەکانی ئاو یا لە پال ڕێگاو بانەکان و هێلەکانی گواستنەوە .

کۆمـەلگا جێنـشینەکان لـە کـاتی نائـارامی و شـێواوی بـارودۆخ ،پـەنا دەبەنەبـەر کۆبوونەوەو چڕبوونەوە ،چونکە پێویستی بوون بە پاراستن و ئاسایش وادەکات کشتیاران لە گوندی گەورەوە چڕبوو کۆببنەوە هەر کاتێکیش مەترسی نـەما و ئـارامی و جێگـری هاتووە ناوچەکە، یەکسەر پەرت دەبنەوەو خانووەکانیان بە شێوەیەکی دوور لەیەك بنیات دەنێن. ئاشکرایە کەبارودۆخی غەیرە سروشتی وادەکات پێویستی کەسەکان زیاتر بیٚ بـۆ پاراستنی هۆزو بایەخدانی، کەئەمـەش هـانی جێنـشینی کـۆکراوەدەدات . بـەلام لەگـەلٚ ئەوەشدا ئارەزووی بەرگریکردن بەتەنها پێکهاتەی گوند یا جۆری دابەشـبوونی خـانووی شی ناکاتەوە ، بەلکو بارودۆخی مێژوویی و نەریتە کۆمەلایەتیەکان زۆر جار کار لەسـەر کەم کردنەوەی ڕۆلی فاکتەرە سروشتیەکان دەکەن لـە سیـستەمی ئـاوەدانی ئێـستاکە و جۆری دابەش بوونی . لە زۆرێك لـە وولاتـانی دەریـای ناوەراسـت گونـدەکان لەسـەر لێژایی گردە دژوارەکان بنیاتنراوە و لە چیاکانی ئەتلەسیش لە بناری چـیاکان بنیـاتنراوە لە ترسی هێرشی شوانکارەکان و داگیرکەر ،لەگەلٚ نەمانی مەترسی دانیـشوانی هـەر زوو گەرانەوە بۆ بلاووبوونەوە لە دۆل و دەشتایە نزمەکان.

**شێوەی خانووی دێهاتی : -**

لێکۆڵینەوەی جوگرافی تایبەت بە شێوەو نەخشەی بیناکاری خانووی دێهاتی، زیاد کردنێکی بنچینەییە لەم بوارەدا بەتایبەتی ئەوەی بە شێوەیێکی ناراستەوخۆ و زانیاریمان پێ دەبەخشێ دەربارەی بۆ چوون و بیرو هەستی مرۆڤ دەربارەی بیناکردن و شێوەکانی و نەخشەسازی و کەرەستەی بینای چونکە جیاوازی لەو گۆڕاوانە ، دەکرێ پەیوەندی هەبێت بەشێوەیەك لە شێوەکان بە جیاوازی ژینگەو ئەو ڕەنگدانەوەی بەهاو توانستی مادی و غەیرە مادی کەدەیخاتە ڕوو.

زانا ( کنیفین ) یش هەوڵی دا بگاتە دەربڕینیکی شوێنی بۆ بۆچوونەکانی بەبیناکردن و نەخشەدانانی خانوو لەوولایەتی لویزیانای ئەمەریکی .(١٣) دەکرێ لێکۆلینەوەدەربارەی خانووی دێهاتی بکرێ وەکو دیاریدەییکی جوگرافی، کە فاکتەری زۆر ئالۆزکاریگەری بەسەرپێکهاتنی هەبووە . چونکە خانووی دێهاتی ڕەنگدانەوەیێکی راستەقینەی بارودۆخی ژینگەو کۆمەڵە ، زانراویشە کە شتێکی وەکو خانوو دێهاتی لەگەڵ سادەیی شارەزای تەکنیك و ئەندازەیی بەکارهاتوو تیایدا بەلاّم دەرئەنجامی شارەزایی کشتیارە بە سروشتی ژینگەکەی . بۆیەش گونجاو بووە لەگەڵ بارودۆخی ژینگەکەی و بەپێی پێویستی بوونی .ئەمەش بە ئاشکرایی دیارە لەو جیاوازیەی کەهەیە لەنەخشەسازیو شێوەی خانوو لە رووی رووبەرو ژمارەی ژوورەکانی خانوو درێژبوونەوەی . ئاشکرایە کشتیار خانوودەکات لە هەرشوێنێك جێگیر بێت لە نزیك دراوسێی و دواتر گوندەکە فراوان دەبێ بە زیاد بوونی قەبارەی دانیشتوانی و پێشکەوتنی پیشەی .لەگەڵ ئەم فراوانبوونەش بۆشاییەکانی نێوان خانووەکان کەمتر دەبێتەوەو ڕێگاکانی ڕۆیشتن هەندێك جار ئەم بووشاییانە دیاری دەکات ،لە زۆربەی کاتدا خانووەکە بە شێوەیەك بینا دەکرێ کەئەنوسێتە خانووی دراوسێی ئەمەش بەبێ جێهێشتنی رووبەری کراوە لە دەوری خانووەکە لەبەر هۆکاری کۆمەڵایەتی و ئابووری یا ئاسایش .ئەمەش وادەکات گوندەکە شێوەی جیاواز لەدرێژبوونەوەیان وەرگرن .لەدۆلەکانی ڕۆژهەلاتی خوارووو

گوندەکۆکراوەکان بە شێوەیەك دەبن کە نزیکترە لە بازنە لەوەی چوارگۆشـە بێـت بـەم شێوەیەش دەمێنێتەوە تا ڕێگایەکی نوێ پێدادەڕوات و وادەکات شێوەکەی بگۆڕدرێ. یا ئەوە تا درێژبوونەوەی خانووەکانی دێهاتی مـەیلی بـۆ شـێوەی لاکێـشەیی یـا ( جـۆری شەریتی ) هەیە لەکاتی درێژبوونەوەی ڕووباریك یا ڕێگـایێکی گواسـتنەوە. لـە کاتێکـدا شێوەی بازنەی دەبێت لەو شوێنانەی کـە ڕێگـایێکی پێـچی هەیـە لـە دەوری بیناکاریـك کەوەکو قەڵایێکی بەرگریکردن بەکارهاتوو ە. هەروەها هەندێك گوند بەوە جیادەکرێتەوە کە خانووەکانی پەرتن و ڕووبەری فراوان لـە نێوانیان هەیە لەگەڵ ئەوەی هەندێك ناوچـە خەڵکەکەی ئازادی نیشتەجێبوونیان هەیە لە هەر شوێنێکی بیانەوەی بەڵام لەگـەڵ ئەمـە، ئارەزووی شێوە کۆنەکەیان هەیە لە کۆبوونەوە،بڕوانە وێنەی ژمارە (٢ )وشـێوەی ژمـارە (١).

وێنەی ژمارە ( ٢ ) گوندی شریتی






**شێوەی (١) چەند جۆرێك لە گوند**

هەروەها گوندی ئەستێرەی هەیە کە لەگەڵ هێڵەکانی بەرزی و نزمی کەنتۆری لایەکانی درێژ دەبێتەوە، لەبەر ئارەزوو کردنی خەلکەکەی بۆ سوود وەرگرتن لە دارستانێك یا لەوەرگایەك . لەپاڵ چاندنی زەوی. دەکرێ ئەم جۆرە گوندەش لە رۆژئاوای ئەوروپا تێبینی بکرێ.

خانووی دێهاتی لەگوندی ناوچە شاخاویەکان شێوەی سێگۆشە وەردەگرێ، کە بنچینەکەی فراوان دەبێت لە خواروی چیاکەو بەرزدەبێتەوە بە ئاراستەی لووتکەکەی. چونکە خانووەکان لە نزیك دۆلەکە بینا دەکرێن دواتر درێژ دەبنەوە لەسەر لێژییەکە، بە شێوەی رێز رێزێك لە پایە تاوەکو ناوەڕاستی لێژییەکە، یا هەندێ بەرزتر. لەکاتێکدا هێلی

یەکەمی خانوو بینا دەکری دەست بە بینا کردنی هێلی دووەم دەکریٚ بە ئاستێکی بەرزتر بەم شێوەش تاوەکو بنیاتنانی گوندەکە تـەواو دەبێـت لـەم شێوەیەشـدا تێبینـی ریزبەنـدی خانووەکان دەکریٚ بەشێوەیەك کەهەر خانوویەك دەبێتـە پایـەیك بـۆ سـەرووتری.ئەمـەش بووتە شتێکی ئاسایی کە هەرخێزانێك سەربانی خانووی بەرامبەری بەکاربهێنیٚ بۆ مەبەستی تایبەتی. ریٚزبەندەکە کەخانوولەخۆودەگریٚ بەرەو کـەمی دەروات هەرچـەند بەرزبینـەوە لەلێژییکەو ژمارەیان کەمتردەبێت تاوای لێ دێ ریزبەندی سەرووی چەندخانوویکی کەم لە خـۆوبگری بـەم شـێوەش گوندەکـە شـێوەیکی سـێ گۆشـە وەردەگـریٚ لـە رووی دابەشبوون خانووەکانی. هەندێك جار ئەم خانووانە بە شێوەیك کۆ دەبنەوە کە یەك ریٚزی درێژپێکبینن. بەلاّم ئەوەی باوە هەر پایەییك چـەند کۆمـەلێك لـە خـۆوبگری و ریگـای تەسك جیایبکاتەوە.

وێنەی ژمارە(٣) گوندی ناوچە شاخاویەکان



لەلایەکی تر، فراوانبوونی بیناکاری هەنـدێك جـار وادەکـات کـە شـێوەی رەسـەنی لەدەست بدات چونکە بیناکاری تازە زۆربەی جار درێژ دەبێتەوە بە ئاراسـتەی پیـشەنگی چیاکان و زەوییە تەختایەکانی نزیك بەرزیەکە، کە زەوییـەکانیان لـەبار بـووە. بەهـەرحالّ

دەکرێ بڵێین لەگەڵ هەندێك زیادەرەوی کە سێ قۆناغ هەیە کە گوندی چیایی پێدا دەڕوات لەکاتی سەرهەڵدان و بەرەو پێشچوونی :قۆناغی یەکەم ئەو خانووانە دەگرێتەوە کەلەگەڵ سەرهەڵدانی گوندەکە بنیاتنراوە و لە بناری چیایەکە کۆ دەبێتەوە بە هێڵی هاوتەریبی یەکتر . لە کاتێکدا دانیشتوانی لە قۆناغی دووەمدا پەنا دەبەنەبە ر بینا کردنی شوێنە بەرزەکانی چیایەکە لەگەڵ ئەستەمی بیناکردن و رووبەروو بوونەوەی خانووەکان بە شێوەیێکی راستەوخۆو بۆ بارودۆخی سروشتی لە باو باران .لە قۆناغی سێیەمدا ئەوا دەست دەکەن بە زیادکرنی خانووەکان لە دەوری گوندە رەسەنەکە جگە لە شوێنە بەرزەکانی بۆیەش درێژ بوونەوەی گوندەکەو فراوان بوونی بە ئاراستەی رۆژهەلات و رۆژئاوا دەبێت کە پێشەنگی چیاکان و زەوی تەختایی هەیە بە تایبەتی لە بارودۆخی ئاسایی و لەگەڵ بەر دەست بوونی ئارامی و جێگیری .بەلآم لەگەڵ ئەوەشدا فاکتەری تر هەیە کە رۆلی دیارترە لە وێنەکێشانی ئاراستەکانی گەشە کردنی گوندو فراوان بوونی لەوانەش درێژبوونەوەی بەرزیکە و پلەی لێژیەو رادەی سەرچاوەکانی ئاو .[١٤]

فراوان بوونی رووبەری گوند لە ناوچە دەشتایی و تەختاییەکاندا وای کردووەخانووەکانی بلآووە بێت لەوانەش ئەوەی ئەم دیاریدەیە رۆنتر بکاتەوە قەبارەی گوندی گەورەیە، کە کۆمەڵێك خانوو لە دەوری سەنتەری گوند درێژ بوونەتەوەولە کاتیکدا هەندێکی تر دوور لەو پەرت بوونە ، خانووەکانیش شێوەی بەرچاوو وەردەگری وشێوەکانی لاکێشەیی و نیمچە بازنەیی و بازنەیی لە هەموویان باوترە . لە ئەفریقیای باشووری بیابان ، خانووە دێهاتیەکان شێوەی گردبوونەوە جیایان دەکاتەوە، بەلآم لەگەڵ ئەوەشدا جۆری زۆرتر هەیە بە پێی هەمە جۆری فاکتەری پەیوەندار بە خانووی دێهاتی. بۆ نموونە لە یەکێك لە هەرێمەکانی نەیجیریا تێبینی گوندی ئەنگوستیلەیی دراوە (الحلقیە ) کە بازنەیێکی تەواو پێك دەهێنێ و ژمارەیێکی زۆر لەخانوو دراوسێی یەکتر یانزیك پێك دێنێ . هەروەها خانووەکانی ئەلکەرال و ئەلماساتی لە ئەفریقیا بە شێوەیێکی بازنەیی بلآوو

دهبێتەوە، لە کاتێکدا ئاژەڵەکانیان لە ناوەراستی بازنەکە کۆ دەبێتەوە کەئەمەش جیاوازە لە گوندەکانی هەرێمی کشتوکاڵی چڕ کە بەهای زەوی کشتوکاڵی بەرزە.

شێوەکانی کشتوکاڵکردنیش رۆڵێکی چاکی هەیە لە دیاریکردنی شێوەی گوندەکان ، نمو زەو یانەی کەبە شێوازێکی بە کۆمەڵ دەچێنرێت هەروەك ناوەراستی ئەوروپا بۆ نموونە، گوندی کۆکراوە بنیات دەنرێ لە شوێنێکی مام ناوەندی زەوییە کشتوکاڵیەکان، بەمەبەستی ئاسان بەگەرخستنی زەوی و گەیشتن پێی . بەلام گەر کشتیار خاوەنی چەند پارچە زەوییەکی کشتوکاڵی بێت ،بەرژەوەندی وا دەخوازێت کە شێوەییەکی ناوەنجی بێت تاوەکو بگاتە کێلگەکانی لێرە شێوەی چوارگۆشەیی یا بازنەیی یا ئەستێرەی وەردەگرێت بە پێی تۆری رێگاو بانی دەرچوو لە سەنتەری نشینگەکە .

رێگەش لێرەدا بایەخێکی چاکی هەیە لە دیاریکردنی شێوەی نشینگە،چونکە لەوانەیەشێوەییەکی درێژی هەبێ گەر لە دۆلێك بووبە دوو بەرزایی لێژ دەورە درابوو،هەروەها گوندی نزیك رووبارەکان ئەوگوندانەش کەلە سەرووی گردەکانە یالە دورگەکانە ئەوا شێوەی چوارگۆشە یا بازنەی وەردەگری لەبەر بچووکی رووبەری بەکەڵك هاتوو بۆ بنیاتنانی گوندەکەشینگە دورگەییە کانیش زۆرجاربازنەیی یا نزیکی بازنەیی دەبن لەوانەشە چوارگۆشە بن لە کاتێکدا فراوانی رووبەری ئاودێری لە ناوچە بیابانەکاندا کۆنترۆلی قەبارەو شێوەی گونددەکات وخانووەکان بە درێژایی پرۆژەی ئاو یا رێرەویکی دابەش دەبن یاخودکۆەبنەوە لە دەوری بیرێك یا هەرسەرچاوەییکی تری ئاوی .

نەخشەی خانووی دێهاتی:

لەوانەیە سادەترین جۆرەکانی خانووی دێهاتی ، خانووی تاك بێت، کەبریتیە لە ژوورێك کە کشتیارو خێزانەکەی بەکاری دەهێنێ وەکو جێنشینێك بۆ خۆیان و لەوانەشە بۆ ئاژەڵەکان و پاراستنی بەروو بوومیش بێت ،بۆیە ناچاردەبێت کە ژوورەکە دابەش بکات بە دیوارێك لە قور یا شتی تر کە جیاکەرەوە بێت لە نێوان خۆیان و ئاژەڵەکانیان.

هەروەکو لە سوودان و سۆماڵ بەدی دەکرێت. هەرچەندەش قـەبارەی خێزانەکـە زۆرتـر بوو ژوورەکان زیاتر دەبن قەبارەی خانووەکـەش گـەورەتر دەبێـت وەکـو دەرئـەنجامێکی جیابوونەوەی خێـزان لەبنەماڵـەی سـەرەکی و سـەربەخۆبوونیان لەوانـە گـۆران بەسـەر قەبارەو نەخشەی خانووەکە دابێت کەمەیلی بۆ بچووکبوونەوە دەبێت بەزۆری ، هەروەها زیاد بوونی ژمارەی دانیشتوان زۆرجار دەبێتە مایـەی زیـاد بـوونی ژمـارەی ژوورەکـانی خانوو . خانووەکان لە زۆربەی کاتدا لەیەك نهۆم پێك دێن ، ئەوەش لەوانەیە بگەرێتـەوە بۆ سروشتی پەیوەندی کۆمەڵایەتی کەجەخت لەسەر دابراوی کۆمەڵایەتی دەکات لە پـاڵ فراوانی زەوی و سرووشتی کەرەستەی خۆمالی بـەکارهاتوو لـە بینـاکردنی دێهـاتی ،لـە کاتێکدا گوندە پلاندانراوەکان زیاتر لەیەك نهۆمی تێدا بەدی دەکرێت .
خانولەناوچەبەرزەکان هەروەکو لـە بـاکووری عێراقـدا هەیـە، زیـاتر لەیـەك ژوور لـە خۆدەگریٚ زۆربەشی کونی بازنەی یا چوارگۆشەیی تێدا یە یـا پەنجـەرەی بـچووك ،ئـەم کونانەش لە شێوەی پەنجەرەدایە ودەرگاکانیش بچووکن وریٚگا بە مرۆڤ نادەن پیٚدا بروات بـەبیٚ خۆنوشـتاندنەوە .هۆکـاری کـەمی و بـچووکی کـون و دەرگـاو پەنجـەرەکان بـۆ کۆمەلێك فاکتەردەگرێتەوە لە پێش هەمووشیان نزم بوونەوەی
پلەکانی گەرمی لە زستانداو کاریگەری بای سارد و جگە لە دەستگرتن (الاقتصاد)لە تێچوونی بیناکاری و دواتریش نە شارەزای بوون بەلایەنەهونەرییەکانی بیناکاری کردن .
خانووەکان لێـرەدا لـەبناری شـاخی بـەرەو رووی خـۆر بنیـات دەنـریٚ لـە بـەرزاییکی دیاریکراو لەپاڵ چیاکان. کە پلەکانی گەرمی گونجاوترە لێرەداو پارێزراوە لە بـای سـارد .ئەم دیاریدەیەش دیمەنێکی جیاکەرەوەی بەخشیوەتە خانووە دێهاتیەکان، چونکە پشتی لـە دەرەوە پێی دەچیٚ زۆر بەرز نەبێت لە عەرزەوە لە کاتێکـدا بەرزیکـەی لـە ژوورەوە دا دەگاتە چەند مەترێك. هەروەها سەربانی خانووەکانیان کەمێك لێـژی هەیـە بـۆ یارمـەتی دانی سەرف کردنی ئاوی باران و بەفر کە لەگەڵ ئەمەش بینـاکردنی خانووەکـان لـەبنار چـیاکان وادەکـات ئاووبـەفر کـۆ نەبێتـەوە . لـە ناوچـە تەختاییـەکان بەتایبـەتی ناوچـە

گەرمەکان ،پەنجەرەکان کە بەشێوەی چوارگۆشەو لاکێشەیی دەبن و هەندێك جاریش
-:نمیی دەبنە ئامرازیك بۆ دەست نیشان کردنی ئاراستەی باو هاتنە ژوورەوەی تیشکی
خۆر بۆیەش کەش وهەوا رۆلێکی گرنگی هەیە لەشێوەو ئەندازەی خانووی دێهاتی،
هەروەکو چۆن تێبینی ئەوە دەکرێ کە لێژییەك هەیە لەسەربانی ناوچە باراناویەکان ،
هەروەها کاریگەری کەشوو هەوا بەسەر ئەستووری دیوارەکان بە دیار دەکەوێت بۆ کەم
کردنەوەی کاریگەری کەش . لە کاتی وەرزی ساردی و لە ناوچە جەمسەرییەکاندا
کۆمەلانی ئەسکیمۆ خانووەکانیان بە چینی بەفری بەستوو دروست دەکەن ( کتل الجليد
لە شێوەی گومەتی خرو دواتر ئەم دیوارە ئەستوورە بە پارچەیەك لە پێستی ئاژەل لە
ژوورەوە دادەپۆشرێت لەگەل جێهێشتنی بۆشاییك لە نێوانیان وەکو چینێکی هەوای
ئابرا وو ئاستی زەوی خانووەکە نزم دەبێتەوە بە نیو مەتر یا مەترێك لە ژێر ئاستی زەوی
دەروە ، کونێکی بچووکیش لە گومەتی ئەم خانووەبە جێ دەهێلدرێت بۆ گۆرینی هەواو
دەرچوونی گازو دووکەل. شێوەی گومەتی لە هەرێمە بەستەلەکیەکان گونجاوە بۆ
بارودۆخی کەشووهەوای بەستەلەکی کەزۆرساردەو بایی بەبەفرە .

لە هەرێمەگەرمەکانیش خانووی دێهاتی بە شێوازیك بینا دەکرێ کەهەبوونی بەشی
کراوەی هەبێ کەبەحەوشە ناودەبرێت لەگەل زیاد کردنی دیوارەکان بۆ پاراستن لە
تیشکی گەرمی خۆر لە پال بوونی سیستەمی دەروازە (نظام الفتحات) کە دەرفەت
بەهاتوو چۆ کردنی هەوا دەدات لە خانووەکدا .لەوانەشە سەربانی خانووەکانیش
شێوەی گومەتی سواقدراو بەرەنگی سپی بگرێتە خۆو بۆبەرتکردنی زۆرترین رادەی
گەرمی و تیشکدانەوەی خۆر .دەکرێ ئەم جۆرە لە خانوو تێبینی بکرێت لە هەندێك
شوێنی باکووری ئەفریقیا هەروەها لە سەعیدی میسر .[١٥].( بڕوانە وێنەی ژمارە (٤ )

وینەی ژمارە ( ٤ )

نموونەی خانووی دێهاتی لەهەرێمەگەرمەکان وێنەی




دانیشتوانی ناوچە گەرمەکانیش بە پێچەوانەی ناوچە مامناوەندە باراناویەکان ، زیادەڕەوی لە فراوان کردنی پەنجەرەو کونەکان دەکەن لەم دواییانەشدا سیستەمی بینا کردنی خانوو بە دیواری بەلوری یا شووشەی ئەستوور هاتەکایەوە لەو تەنیشتانەیکە بەرەو رووی تیشکە خۆر دەبنەوە. لە کاتێکدا دەبینین ە پەنجەرەو دەرگاکان تەسك و بچووك دەبنەوە لە ناوچە ساردەکاندا وشوێنی تایبەت بە گەرم کردنەوە تەرخان دەکرێت کە لوولەی سۆپاکانیان بەرز دەبێتەلە خانووەکە کەئەمەش لە نیشانەکانی ژینگەی سارده

پێکهاتەی خانوونی دێهاتی:

لەگەڵ ئەوەی نەخشەییکی پێشەکی نیە بۆبیناکردنی خانوو لە دێهاتکاندا بە گشتی ،بەڵام چەند بنچینەییکی هاوبەش هەیە کە بە شێوەییکی نەریتی(عرف) کۆکبوونە لەسەری لە ڕێگەی ئەو شارەزایەی کە کۆبۆتەوە لەگەڵ بەها کۆمەلایەتیەکان و پاشماوەی بۆیە دەکرێ بلێین کە خانووی دێهاتی پێکهاتانەلەخۆو دەگرێ : ( بڕوانە شێوەی ( ٢ ) )

١- ژووری نووستن ٢ – حەوشە ٣ – کۆگا ٤- دیوەخان(هەندی جار)

٥- شوینی ئاژەل




شێوەی ( ٢ ) نەخشەی خانووی دێهاتی

ئەم پێکهاتانەش جیاوازە لە رووی جۆرو رووبەری ، بە پێی جیاوازی قەبارەی خێزان و پێداویستیەکانی و ئاستی بژێوی . ئەوەی خوارەوەش پێناسە کردنێکی ئەم پێکهاتانەیە:

١ – ژووری نووستن :

هیچ خانوویکی دێهاتی نیە ژوورێك یا چەند ژوورێکی نووستنی تایبەت بە کەسەکانی خێزان ،تیادانەبێت. ئەمەش بە پێی قەبارەو ڕادەی بەرهەم هێنانی خێزانی کشتوکاڵیە . ژوورەکەش بە شێوەیکی لاکێشەیی دەبێت و هەندێ جاریش چوارگۆشە .

٢– دیوەخان (المچیف) :

ئەمەش ڕەنگدانەوەی ئاستی کۆمەلایەتی و ئابووری خێزانە ، لە پاڵ بەکار هێنانی وەکو ژوورێکی خواردن وەکو بنکەیەکی جێنشینی میوان و بێگانە. دەکرێ بلێین کە پێگەی کەسێك لە گوندەکە پەیوەندی هەیە بە شێوەییك یا ئەوی تر ، بە فراوانی و جۆری بیناکاری دیوەخانەکەی . ئەویش بە رووبەروو شێوە جیاوازە بە پێی پێگەی کۆمەلایەتی و توانای ئابووری خێزانەکە. دیوەخانیش بە پێی نەریتی لە دەرگای دەرەوە دەبێ و دابڕاوە

لە ژوورەکانی تری خانوو، هەروەها ئاراستەی دەرگاکەی بەرو دەرەوەیە بۆ بە دەست هێنانی دابرانی کۆمەڵایەتی.

**٣- هەیوان (الگارمە)**

کەوەکو ژوورێکی کراوەیە بەسەر حەوشەدا و بۆ دانیشتنی کەسەکانی خێزان بەکار دێت یا نان دەخۆن تیایدا.

**٤- حەوشە**

بریتیە لە گۆڕەپانێکی کراوە لەناوەڕستی خانووی دێهاتی ،ژوورەکانیشی دابەشی دەبنە سەر تەنیشتەکانی. هەبوونی حەوشە یارمەتی ئاڵوگۆڕکردنی هەوای خانووەکە دەدات ،هەروەها فێنکی دەکات لە هاویندا و تیشکی خۆریش لە ژوورەکان دەدات لە زستاندا. هەروەها رووبەریکە خێزان تیایدا جوجۆل دەکات و شوێنی دانیشتنیانیش دەبی لە پاڵ کردنی بە شوێنێکی گونجاو بۆ خەوتنی خێزان لەشەوانی هاویندا. هەندێك جاریش وەکو شوێنێکی ڕاگرتنی ئاژەڵ بەکار دێت. زۆربەی ئەم خانووانەش یەك دەرگای چونە ژوورەوەی هەیە کە خێزان و ئاژەڵەکان بەهاووبەشی بەکاری دێنن.

**٥- شوێنی ئاژەڵ (حجیرە الحیوانات):**

ئەمەش جێگای حەوانەوەی ئاژەڵەو هەندێك جار بە جیا لەگەڵ خانوو بنیات دەکرێ بۆیە بە شەوان دادەخرێ لەبەر پارێزگاریکردن لە ئاژەڵەکان و لەوانەشە بە پەرژینی خانووەکە دەور درابێ و بەرێگای دەرگای خانووەکە بچیتە ژوورەوە .لە تەنیشت شوێنی ئاژەڵیش کۆگای ئالیك هەیە کە ڕووبەرەکەی بە پێی ژمارەو جۆری ئاژەڵی خێزان دیاری دەکرێ و بۆ هەڵگرتنی ئالیك بۆ وەرزی زستان بەکارد یێت. ئاشکرایە کەوا ئەندازەو بینا کردنی خانووی دێهاتی پەیوەستە بە شێوەیکی سەرەکی بە پیشەی ئابووری خێزانکە، کەئایا کشتوکاڵکردنە یا شوانکاریە یا هەردووکیەتی،یا خود خێزانە کە کاری ڕاو یا برێنی دار ئەنجامەدا. ئەمەش ئاستی ئابووری ئەو خێزانانە دیاری دەکات ئەو خێزانە دێهاتیەی کە بەخێوکردنی ئاژەڵ ئەنجام دەدا ڕووبەرێکی چاکی زەوی هەیەو پارچەییکی

گەورە بۆ جێنشین بەکاردێنێ . لە کاتێکدا دەبینین ئەو خێزانەی کە پسپۆرە لە چاندنی بەرووبوم ڕووبەرێکی بچووکی هەیە چونکە خانووەکە تەنها بۆ داڵدەی خێزانەکە بەکاردێت.

کەرەستەی بیناکاری :

خانووی دێهاتی دەربڕینێکی ڕاسەقینەی ژینگەی سرووشتی دێهاتیە، بە بەراورد لەگەڵ خانووی شاری. هەندێك پسپۆران بۆ جیاکردنەوەی جۆرەکانی هەرێمی بیناکردن پەنایان بردۆتە بەر جۆری کەرەستەی بەکار هاتوو لە داپۆشینی سەقفی خانوو شێوەی بیناکاری کە ئایا تەختە یا لێژە. چونکە ئەو خانووانەی کە داپۆشراوە بە پوش یا دار یا قور ،پلەی پەیوەستبوونی بەهێزە لە نێوان جۆری کەرەستەی بەکار هاتوو پێکهاتەی ژینگەکەی لەگەڵ ئەو بەرەو پێشچوونەی هۆیەکانی گواستنەوەش لە دێهاتەکاندا. بەلام ئەم جۆرە پەیوەست بوونە تاوەکو ئێستاش بە هێزە .(١٦)

کەرەستەی بیناکاری (لە رووی کەرەستەی خاووی دەستکەوتوو لێی) دابەش دەبێتە دووجۆر: سرووشتی و دەستکرد. ئەوەی یەکەمیان لە زەوی دەردەهێنرێت و بە شێوەیێکی ڕاستەوخۆ لە بیناکاری بەکاردەهێنرێ. وەکو گڵ، قوڕ ، بەرد و کەرەستەی بیناکاری دا ریی و پەلکی وەکو لقەکانی داروو دارخورما و قاچەکانی داروو پووش . لە کاتێکدا ئەوەی دووەم بریتیە لەو کەرەستە بیناکاریە دروست کراوانەی وەکو کەرپوچ و چیمەنتۆ و گەچ و شووشە .

خانووی دێهاتی لە رووی کەرەستەو جۆری بیناکاری ، نیشانەی رادەی بەردەستبوونی کەرەستەی خاووی پەیوەندارە بە بیناکردن دەدات . هەروەها سرووشتی خانووی دێهاتی و بەردەستبوونی کەرەستەی پێویست بۆ بیناکردن پەیوەندییکی پتەوی هەیە لەگەڵ ئاستی ئابووری مرۆڤ و شێوازی بژێوی و مەبەستی لە بیناکردن . دێ نشینەکان بە زۆری پەنا دەبەنەبەر بەکار هێنانی کەرەستەی ژینگەی خۆماڵی بۆ بیناکردن بۆیەش دەبینین کەزۆربەی خانووە دێهاتیەکان بە قوڕ یا خشت کەلە پاشماوەی لیتەی

رووبارەکان یا لە پاشماوەی گڵـی دوای راستکرنەوەی زەوی پەیدا دەبێ. کە دواتر پووشی بۆ زیاد دەکرێ لە هەردوو حالەتدا یا هەندێ رووەکی وەریوو . داری پێویستیش بۆ سەقف و دەرگاکان لەو دارانە دەبڕدرێ کەلە پەراوێزی کێڵگەکان یا لە تەنیشت رووبارو جۆگەکان گەشە دەکات و دواتر سەقفەکە بە لقی دار یا بە حەسیر دادەپۆشرێت و دواتر بە چینێکی قوڕ .

لەلایەکی ترەوە ، نابێ جەخت لەسەر گونجاوی و پەیوەست بوون لە هەموو بارودۆخێك وهەموو شوێنێك بکرێ .چونکە لەوانەیە بیناکاری بە کەرەستەی هاوردەی باشتر لەدەرەوەی هەرێمەکە بکرێ وەکو ئەوەی خانووەکانی هەرێمی ( ئەستێبس ) ی کەم دارستان لە داردروستدەکرێ، هەروەها لەوانەیە بەرد لە و ژینگانە دا بەکاربهێنرێت کە نییە بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا بنەمای گشتی ئەوەیەکە خانووی دێهاتی لە خشت دروست بکرێ لە هەرشوێنێك کە قوڕ هەبێت ولەدار دروست بکرێ لە ناوچەی دارستانەکان . لەوانەشە جووتیار بەرد بەکار بهێنێ کە تەنها کەرەستەی بەردەستە لە هەرێم و زەوییە دارستانەکانی ئەوروپا و یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو و ئەمەریکای باکوور تێبینی دەکرێ کە دار کەرەستەی بیناکاری باوە هەتاوەکو لە هەرێمی رۆژئاوای ئەوروپا کە خانووی دێهاتی بە دار درستکراو جۆرێکی سەیرو نەشازە ئەوا خانووەکانی لە تەختەی ستوونی چوارگۆشە داریی دروست دەکرێن و دواتر بۆشاییکانی نێوانیان بە کەرپوچ یا بەرد پڕ دەکرێتەوە . دەکرێ بلاو بوونی بیناکاری دار لە ئەمەریکای باکوور بۆ هەبوونی دارستان و بلاّووە بونی بگەرێنینەوە، چونکە رێژەی بیناکاری بەم جۆرە گەیشتە نزیکەی ٩٠ ٪ ی تێکڕای خانووەدێهاتیەکانی وویلایەتە یەکگرتووەکان .

لە ئەفریقیاش، دانیشتوانی، لقی داروو گژوگیایان بە کار هێناوە بۆ دروستکردنی خانووەکانیان ، ئاشکراشە کەئەم جۆرە کەرەستانە قورسایی زۆر هەڵناگری و ناتوانری نهۆمی دیکەی لەسەر دروست بکرێ بۆیە جێنشینی تیایدا ، کۆخی چوارگۆشە یا بازنەییە

سەقفەکەی بە پەڵ و پۆی داروو گژگیای ووشك داپۆشراوە ( بڕوانە وێنەی ------ ) .

وێنەی ژمارە( ٥ )خانووی دێهاتی چوارگۆشە وبازنەیی





مرۆڤ لە هەرێمە ووشك و نیمچە ووشکەکان ،پەنا دەباتە بەر زەوی خۆی بۆ بەدەستهێنانی کەرەسەی بینا چونکە خاکی بە کاردێت بۆ بینا کاری خانوو کە قالبی قوڕ لەژێر خۆردا ووشك دەکرێتەوە یا بە بەکارهێنانی ئاگر ڕەق دەکرێت بۆ ئەوەی توندو تۆڵتر بێت .بەڵام لە هەرێمەکانی باراناوی خانووەکان لە کەرەستەی وا دروست دەکرێ کە بەرگری شێداری بکات و بە شێوەیێکی لێژ دادەپۆشرێ لەلایەك یا دوولاوە ئامرازەکانی سەرف کردنی بارانیش دادەندرێ بۆی .

خانووەکانیش لە ناوچەی زۆنگ و زەلکاوەکان هەمە جۆرن لە ڕووی شێوەو کەرەستەی بینا ، کە ئەمەش کاریگەری بە ژینگە و چوارچێوەی جوگرافی دەردەخات لە پاڵ کۆمەلێك فاکتەری کۆمەلایەتی و ئابووری . لێرە دا خانوو لە رووەکی بەردی و قامیش دروست دەکرێت کەیەکەمیان لە هەموو ناوچەیێکی زەلکاوەکان گەشە دەکات لە پاڵ ڕێرەوی رووبارو جۆگەکانیشی ، بەلام تەنها لە قوولاییکانی هەیە .

شتێکی سرووشتیه کە هەبوونی کەرەستەی بیناکاری لە هەرێمێکی دیاریکراو دا وادەکات کە تایبەتمەندی ئاشکرای هەبێت چونکە هەروەکو چۆن بیناکردن بە قامیش و بەردی باوە لە زەلکاوەکاندا ئەوهاش بینای قور لە ناوچەووشك و نیمچە ووشکەکان .لە کاتێکدا ناوچەی ساردو باراناوییکان بە بینای دار یا بەرد جیا دەکرێتەوە، کە زۆربەی جار سەقفەکەی بە بۆیەی ڕەش ڕەنگ دەکرێن بەلاّم دیوارەکان بە سپی .هەروەها خانووی نیمچە داریش هەیە لە هەرێمە سنوورییکان لە ویلزو ئینگیلتەرا .

بیناکاریش بە کەرپوچی سوور لە هەرێمەکانی ناوەراستی ئینگیلتەرا هەیە وە بەردی جیری لە هەرێمەکانی باشوور لە بەریتانیا .لە پاڵ ئەممەش کە دیواری بەفری هەیە کە هێشتا کۆمەڵی ئەسکیمۆ دروستی دەکەن لە بەفر ، هەروەها ژمارەییکی زۆر لە ئەکواخ هەیە بە شێوەی بیناکاری هەمە جۆر کەلە دار یا پوش یا قوڕیا هەندێك جار لە تەنەکەدروست دەکرێ.

پێکهاتەی پیشەیی خانووی دێهاتی

پیشەی جێنشینی(الوظیفه السکنیه) دیارترین دیاریدەی ژینیە لە گوندەکان ، بەلکو ڕەنگدانەوەی راستی پسپۆریتی ئابووری ، کۆمەلاّیەتیە، هەروەکو چۆن پیشەی چەندین رەهەندی مۆرفۆلۆژی دەردەخات بۆ خانوو ئەوهاش خانوو بە پێی شوێن و تایبەتمەندی ڕەنگدانەوەی پسپۆریتی لەپیشەی. لەوانەشە چەندین بەکارهێنان لەگوند پەیدا ببێ بە هۆی پێشکەوتنی مێژوویی پیشەکان یەك بە دوای یەکدا، ئەم گۆڕانەش لەوانەیە بە هۆی هەمەجۆری لە سیستەمی بە کارهێنان زەوی وئەو قۆناغە شارستانیەی کە هەیەو ئاستی بژێوی بێتە کایەوە. لە پاڵ بوونی جیاوا زی لە ڕادەی وولاّمدانەوە بۆ بارووردۆخی ژینگەی خوجیەتی و توانای راستەقینەی .

لەسەر بنەمای ئەم جیاوازیانەش خانووەکان دابەش دەبنە سەر چەند جۆرێك بەپێی قۆناغی شارستانی کۆمەلگای دیاریکراوو بارووردۆخی سرووشتی و مرۆیی پەیوەندار.

پیشەی جێنشین بایەخێکی گرنگی پیشەی نشینگە دێهاتیەکە پێك دەهێنی کەپێی دەگوترێت (دالّدە-ماوی) مرۆڤیش هەولّی پەیداکردنی شوێنی حەوانەوەی داوە لەدوای بەدەستهێنانی خواردن یەکسەر. چونکە خانوو دە بپارێزێت لە زیندەوەرەکانی تر بە جیاوازی جۆرو شێوەی، هەروەها دەیپارێزێت لە سەختی سرووشت و گۆڕانکاریکانی .لەگەلّ بلاّووبونەوەی ئارامی و جێگری لە چەرخی نویّ پاراستن بەپێی تێگەیشتنی کۆن هیچ مانایکی نەبوو، پیشەی سەرەکی سەنتەرەکانی دیّ نشینی لە پالّ پیشەی جێنشین پیشەی تر هەبوو کە گرنگترینان پیشەی خزمەتگوزاری بوو .لەوانەش قوتابخانەو بنکە تەندروستیەکان و بنکە کارگێڕیەکانی کۆمەلاّیەتی وو حەوانەو. کە مرۆڤ رۆژانە پێویستی پێیەتی . سەبارەت بە پیشەکانی بازرگانی و پیشەسازی و ئایینی ئەوا دەوەستێتە سەر قۆناغی شارستانی و فاکتەری سەرهەلّدانی ، لە پالّ توانا ئابووریەکانی. مزگەوت و پەرستگاکان ومەرقەدەکانیش، چەند شوێنێکن پەیوەندیان بە پیشەی ئایینیەوەهەیە. کەئەویش جیاوازە لە رووی رۆلی و بایەخدانی لە نشینگەیەکەوە بۆ ئەوی تر و کاریگەریکی ئاشکراش هەیە لە زۆرێك لەو نشینگانەی کە گرنگیان هەیە لەبەر ئەم لایەنانە .

لە گوندی تازەو نەخشەکێشراویش ، پلاندانەران رەچاوی دامەزراندنی خزمەتگوزارییە پێویستەکان دەبن لە سەنتەری گوندەکە، دواتر خانووەکانیش لە دەوری دائەنرێن ، چونکە لەوێدا خزمەتگوزاری هەمەجۆر کۆدەبێتەوە کە ئابووری یا کۆمەلاّیتی بێت (فێرکردن ، تەندروستی ، ئایینی ) هەروەها کارگێڕی .

دەکریّ پێکهاتەی پیشەیی بەرەو پێش ببریّ لە رێگەی بایەخدان بە نەخشەکێشان و هەلّبژاردنی کەرەستەی بیناکاری بەردەست و گونجاو بەمەرجێك دەبێت توندو تۆل بێت ،هەروەها رووبەرو شوێنە کراوەکانی تێدابێت بە شێوەیکی گونجاو لەگەلّ ژینگەکەی.

## سەرچاوەو پەراوێزی بەشی دووەم


١- بروانە G.Conzn; Aluwick A study in Town-plan Analysis ,Trans Insj Br George ,٢٧London,١٩٦٩. هەروەها ، خالص الاشعب،مورفولوجية المدينة،ص١٠-٢٠.

٢- Baker; The Geography of Rural settlement, Exeter, ١٩٦٩, p١٢٥.

٣- Houston. J.M; Asocial Geography of Europe, London, ١٩٥٣, p٨٥.

٤- بروانە: عبدالفتاح محمد وهيبة، جغرافية الانسان،دار النهضة العربية، بيروت، ١٩٨٠،ص٥٠٥.

٥- خليل اسماعيل محمد، انماط الاستيطان الريفي في العراق،مطبعة الحوادث، ١٩٨٢،بغداد ،ص٢٤٢.

٦- عبدالفتاح محمد وهيبة، المصدر السابق،ص٥١١.

٧- لباد ابراهيم عبد الرحمن، ولاية جيجل، رسالة ماجستير، جامعة بغداد،١٩٨٦ ،ص١٤٤.

٨- محمد حجازى ، جغرافية الارياف ،دار الفكر العربي ،الكويت،١٩٨٢، ص١٩٣.

٩- بروانة: محي الدين صابرولويس صعيكة، البدووالبداوة ،ص١٤٥.

١٠- شاكر خصباك،الاكراد،مطبعة شفيق، بغداد، ١٩٧٢،ص٥٠.

١١- عبدالفتاح محمد وهيبة، المصدر السابق،ص٥١٥.

١٢- بروانه: لباد ابراهيم عبد الرحمن، المصدر السابق،ص١٤٥.

١٣- هارتشون،طبيعة الجغرافية،ترجمة شاكرخصباك، ج١، ١٩٨٤،ص٣٥٤-٣٦٠.

١٤- خليل اسماعيل محمد، المصدر السابق،ص٢٣٧.

١٥- بروانه: محمد حجازى ، المصدر السابق،ص١٨١.

١٦- المصدر نفسه، ص ١٨٠.

## بەشی سێیەم
## تەرزی دابە شبوونی نشینگە دێهاتیەکان

**پێشەکی :**

مرۆڤ لە و کاتەی بلاَووبۆتەوە لەسەر زەوی مەیلی بۆ ژیانی بە کۆمەل بردووە و هەر چەندە قەبارەی ئەم کۆمەلە گەورەتر بوایە هۆکارێك بوو بۆ زیاتر بە دیهێنانی ئارامی و جێگیری بۆیە کە جۆری کۆکراوەی دانیشتوانی یەکەم وێنەی جێگیر بوونی مرۆڤە لە جیهان لە کاتێکدا جۆری بلاَووە بووی نیشتە جێی لەو کاتەدا پەیدا بوو کە ئارامی پاراستن بەردەست بۆ مرۆڤ بۆیەش کۆکراوە پێشووترە لە رووی پەیدا بوونەوە لە بلاووە . بۆ نموونە بۆئەم حالەتەش سروشتی ژیانی کۆمەلایەتی لەلای کۆمەلە سەرەتاییەکانی جیهان وەکو هیندیە سوورەکان و دانیشتوانئەلبور لە ئەمریکای باشوور .

لەلایەکی ترەوە هەرێمەکانی کشتوکالّی چڕ قەلەبالغە بە هێزی کارو خانووەکانیان بەرامبەر کەمی ڕووبەری کشتوکالّی بەرەو یەکەوە نووساو ( ملتصق ) دەچێ،هەروەکو تێبینی دەکرێ لە نشینگە گوندیەکانی میسرو هیندستانو وولاتانی باشووری خۆرئاوای دوورگەی عەرەب.نموونەی نیشتەجێی کۆکراوە ئەوەی تێبینی دەکرێ لە ولاتی چین لەبەر نەبوونی زەوی فراوان بۆ کشتوکالکردن، دانیشتوان ناچار بوونە گوندەکانیان لەسەر ڕێچکە ئاویەکان بنیات بنێن لە شێوەی خانووی نیمچە سەر ئاوو جێگیر هەروەکو چۆن تێبینی دەکرێ لە هەندێ شوێنەکانی دەلتای چین ولە بورینوی باکوور.لە پالّ نیشتە جێی چروپرلە یابان نشینگەی بچووکیش هەیە کە ( ١٥ – ٢٠ ) خانووی کشتوکال لە خۆی دەگرێ لە کاتێك جۆری بلاَووە بوو تێبینی دەکرێ لە دوورگەی هوکایدو هەروەها لە خۆرئاوای ناوەند لە وولایەتە یەکگرتووەکان .[1]

شێوەی جیا کردنەوەی نیشتە جێی دێهاتی لە ئەفریقیاش چڕ بوونەوەیە لە هەرێمی باشووری بیابانی گەورەوەکو گوندە کۆکراوەکان و نزیك لە یەکتری لە نیجیریا لە پالّ سەنتەرەکان نیشتە جێ بوونی دێهاتی بلاَووەو پەرش و بلاوە.

هەرچەندە زانا ( متزن ) دوو جۆر لە نشینگەکانی دەست نیشان کرد لە ئەوروپا کە کۆکراوەو بلاَووە یەبەلاَم ئەم گۆرانکاریە خێرایانەی کەبەسەر هۆیەکانی گواستنەوەو

گەیاندن هات وای کرد ئەم شێوازە تێك بچێت . بۆ نموونە گوندی کۆکراوەی گردبوو ( مرکزە ) جۆرێکی سەرەکی یە لە باکوورو خۆرهەلاتی فەرەنسا لە هەمان کاتدا تێبینی نیشتەجێی بوو بکەین لە ( بریتانی ) و هەرێمی ناوەندی فەرەنسا . نیشتەجێی تێکەلیش لە باشوورو خۆرهەلات بەدیار دەکەوێ کە جۆرێکی تێکەلە لە کۆکراوەو بلاووە نیشتەجێی دێهاتی لە ئەلمانیاش پەیوەستە بەو گۆرانکاریانەی کەبەسەر ژینگەی داهاتووە لە چەرخە مێژوویەکانەوە چونکەفراوان بوون و بلاوو بوونەوەی نیشتە جێی شان بەشانی ئەو گۆرانکاریە ئابووری و کۆمەلاتیانە بەرێوەچووکەهەر قۆناغێکی مێژوویی لەوی تر جیای دەکردەوە تا ئێستاش نیشتە جێی بلاوو هەیە پەیوەست بە خاکی ( ئەللویس ) شوێنی دیارە بەسەر جۆری ئێستای نیشتە جێی .

دەکرێ تێبینی جۆرێکی تری نیشتەجێی بکەین کەبە گوندی یەك رێگا دەناسرێ ئەم جۆرەش کاتێك پەیدا دەبێت کە رێگایەکی سەرەکی هاتووچۆ بەناوچەکەدا تێپەر بێت هەروەها جۆرێکە تریش هەیە لە گوندی بازنەیی کەلەهەرێمە تازەکانی یا پەراوێزەکانی نێوان ناوچەکانی (جەرمانی وسلاڤی )یە. (٢)

لە بەریتانیاش تێبینی سیستەمی دێهاتی بلاوو بۆ نشینگەکان لە زەویە نزم دەشتاییەکان دەکرێت و سیستەمی دێهاتی بلاوو لەبەشە بەرزەکاندا لە خۆرئاواو باکووریش جۆری پەرش بلاووەش لە هەریەك لە ئیرلەندا و ئوسکتلندا تێبینی دەکرێ لە کاتێکدا جۆری بلاووە لە دوای گۆرانکاری یەکەم هات کەبەوە جیا دەکراوە کە کۆکراوەیە لە رووی دێ نشینی.ئاوەدانکردنەوەی جیهانی نوێش پەیوەشت بوو بە جۆرو پلەشکۆی نیشتەجێ بووەکان و ئەو شارەزایانەی کە گواستیانەوە بۆ وولاتی دووەمیان و بەکارهێنانی زەوی وای کرد کە سیستەمی بلاوە زاڵ بێت بە سەر شێوەو ئەندازەی نشینگە و شێوەی لەو ناوچانەی پەیوەست بوو وەکو گوند هێلکرد یا شەریتی و گوندی ئەستێرەیی و چوارگۆشە. (٣)

**تەرزەکانی دابەش بوونی نشینگە دێهاتیەکان :**

دابەش بوونی جوگرافی نشینگە دێهاتیەکان بنچینەی لێکۆلینەوەکان تایبەت بە جوگرافیایی دێنشینی پێك دەهێنێ بۆ گەیشتن بە ئاشکرا کردنی تەرزەکانی دابەش بوون لەلایەکی ترەوە ئەو هۆکارانەی کەکاریان کردۆتە سەر دابەش بوونەکە لەلایەکی ترەوە . تەرز – جۆر (pattern) زاراوەیەکە زۆر بەکاردێت لە لێکۆلینەوە زانستیەکاندا و بۆ ئەوەبەکار دێت کە نیشانەی دابەش بوونە. [٤] لەلای جوگرافیەکانیش ئەو شێوەیە کەبە پێی دیاریدەکان رێك دەخرێت لەسەر رووی زەوی جۆریش لەم لێکۆلینەوەیە نیشانەی دابەش بوونی سەنتەرەکانی دێهاتیەو ئەو سیستەمەی کەوەری دەگرێ لە دابەشبوونەکەدا هەروەکو چۆن نشینگەکان جیاوازن لە رووی قەبارەوە هەر ئەوهاش جیاوازن لە رووی وێنەی دابەش بوونیان و بلاوو بوونیان هەندێك گوند شێوەی ئەندازەیی رێك وەردەگرێ هەندێکیش بلاوو دەبێتەوە بەبێ رێك خستن وە لە کاتێکدا هەندێ شێوەی کۆکراوەی سەنتەر دەگرێتە خۆ و هەندێکی تری بە ئاراستەی رێگاوبان و رووبارەکاندا دەروات .

دەکرێ جۆرەکانی دێ نشینی دەست نیشان بکەین لە رێگەی پەیوەندی نێوان خانووەکان و شێوەی دابەشبوونیان بۆ دەست نیشان کردنی جۆری ئەم پەیوەندیەش دەکرێ نەخشەیەکی ووردی شوێنی لێکۆلینەوەبەدەست بهێندرێ و خانووەکانی لەسەر دیاری بکرێ بە شێوەی خاڵ. (٥) زۆر گرنگە کە رەهەندی مێژوویی بایەخی پێ بدرێت چونکە جێگیر بوونی لادێی نەگەیشتە ئاستی ئەمرۆی ئەگەر بە زنجیرەیەك پێشکەوتنی جۆراوجۆر تێپەر نەبوایە ، چەندەها سەنتەری جێنشینی بنیات نراوەدواتر لەناوچوودواتر لەسەری یاخود لە نزیکی نشینگەی تر بنیات نراوە چەند گۆرانکاری بەسەر داهات ئامرازی نۆێ و شێوەی نوێ پەیدا بوو بۆ دیزاینی خانوو کردن یاخود شێوەی ئەندازەیی گومان لەوە دانیە کە پەیوەندی هەیە لە نێوان جۆری بلاٌوبوونەوەو دابەش بوونی شینگەکان و هۆکارەکانی دامەزراندنی جیاوازی ژینگەی سروشت لەسەر رووی زەوی و ئاووهەواو رووەك و ئاو ، بێ گومان دەبێتە مایەی پەیدا کردنی بەهای شوێنی جیاواز

مرۆڤ باشترەکەی هەڵ دەبژێرێ بۆ نیشتە جێ بوونی و ئەنجام دانی چالاکی ئابووری.زانا Hagget جەختی کردەسەرئەوەی کە دەرامەتی سروشتی رۆڵێ گرنگی هەیە لە دیاری کردنی جۆری نیشتە جێ بوون . هەندێ گوند هەیە شێوەی درێژ وەردەگرێ لەگەل ئاراستەی رێرەوێکی ئاویدا یا درێژ بوونەوەی رێگایەك ، هەندێکیش بە شێوەی یەکسان بلاوو دەبێتەوە بە پێی بلاّوو بوونەوەی دەرامەتی ئابووری ، یاخود کۆ دەبێتەوە لە یەك سەنتەردا لەبەر ئەوەی دەرامەتەکە بە تەنها پەیوەستە بەبیرێکی ئاوو یا شوێنێکی پاڕاستن کە ئەمەش دەبێتە مایەی جۆری کۆکراوە. (٦) لەلایەکی ترەوە زانا Scarin وا دەبینێ کە گوندەکان لەو شوێنانە بنیات نەنراون کە ئاوی لێ هەیە بەلکۆ مرۆڤ لەهەر شوێنێکی ئارەزووی بکردایە دایدەمەزراند لە ئاوە نزیکەکانی دەوراوپشتی پێویستی بەدەست دەهێنا هەروەها بۆ ئاژەلەکان و بۆ کشتوکال کردنیش. (٧)

جوگرافیزانەکان پشت بەدوورێگا دەبەستن بۆ بەدیار خستنی تەرزەکانی نیشتەجێی لادێی : یەکەم تێبینی راستەوخۆ، دووەمیش ئامارەکان . لەوانەیە پشت بەستن بە تێبینی راستەوخۆ پالپشت بە نەخشە باشترین رێگە بێت بەلاّم چایش نیە کە داتاکانی بەر دەستیش بەکار بهێنرێ بۆ بە دەست هێنانی دەرئەنجامی ووردترو دروست تر .

لە ژێر رۆشنایی ئەوەی کە باس کرا دەکرێ ئەم تەرزە دابەشبوونانە دەست نیشان بکەین :

١ / نیشتەجێی تاك ( منعزل ) :

لێرەدا مرۆڤ و خێزانەکەی لەسەر زەویە کشتوکالیەکان خانوودەکەن بۆ ئەوەی هەر خۆی کاربکات لەوانەش جووتیار شوێنی ئاژەلیش بکات لە دەوراوپشتی مالەکەی هەروەها کۆگاو بیناو کاری تری پێویستە لەوانەش هەندێك خانووی کرێکارانی یارمەتی دەری بکات بە تایبەتی لە زەویە فراوانەکان کە مولکداریەتی زۆردوورە لەیەکتری ئەوەی ئاشکرایە کە مرۆڤ حەزی لە جێگیر بوونی بە کۆمەل هەیە بەلام هەندێك هۆعیە

کەوادەکات هەندێك جار بەتاك نیشتە جیّ بێت ئەم جۆرە لـە نـشینگەکان لـەو شـوینانە بلاووە دەبێت کە ئامادەبوونی پێویستە لە کێلگەکەی .
هەروەها لـە شوێنانە پەیدا دەبیّ کو رووبەری مولـکداریەتی کشتوکالی گەورەیـە دەکـریّ تێبینی ئەم جۆرە لـە نیشتەجێی بکـەین لــە دێهـاتی کەنـەدی و ئـەمریکی لـە ئوسـترالیا و نیوزلـەنداوئەرجــەنتین کــە زەوی فراوانیــان هەیــە و یارمــەتی خێــزان دەدات لــەناو کێلگەکاندانیشتە جیّ بن هەروەها بە پیتی زەوی و زۆربوونی دارسـتان و سەرچـاوەکانی ئاوو چەند هۆکارێکن کەوا دەکات بەرەو نیشتەجێی تاك بروات کشتیار . مولـکداریـەتی تاك بەوە لـە شوێنە شاخاویەکان دا بە شێوەیەکی دیارە چونکە رووی زەوی پیارچە کراوە بەرزی و نزمی جیاوازە هەروەکو چۆن تێبینی بەرزایەکانی ئەورووپا دەکرێت بە تایبەتی لە سویسراو نەمسا وە لـە ناوچە شاخاویەکانی ئاسیاو بەرزایەکانی خۆرهەلاتی ئەفریقیا . (٨)
لە تایبەتمەندیەکانی ئەم جۆرە نیشتەجیّ بوونـە نزیکـی جووتیـار لــە کێلـکەکـەی ئاسـانی سـەرپەرشتی کردنی بەلام دابراوی جووتیارلـە دەوروبـەری پەیوەنیـە کۆمەلایـەتی یـەکان سنووردار دەکـات یارمـەتی کردنـی خزمـەت گـوزاری سـەرەکی بـۆ نـادات بەتایبـەت خزمەتگوزاری ئاوو کارەبا و دەزگای فێرکردن و تەندروستی و رێگاو بـان . بـۆ ئـەوەی هەندیّ لە خراپەکانی ئەم جۆرە کـەم بکرێتـەوە جووتیارەکـان خانووەکانیـان لــە شـوێنە بنیات کرد لـەسەر زەویەکە نزیکە لەو لەو جیّ یەی کە خانووی جووتیـارانی تـری لێیـە شێوەش ژمارەیەك لـە خانووکۆمەلگایەکی نزیك لە یەکتر کۆ دەبیتـەوە ئەمانـە دەبێتـە لــە ناوبردنی بەتەنیایی دابران هەروەها خەرجییەکانی خزمەتگوزاری دەزگا گشتی یەکان کـەم دەکاتەوە . (٩) بروانە وێنەی ژمارە (٦).




وێنەی ( ٦ ) خانووی دێهاتی تاك

٢ / نیشتەجێی بلاَوەبوو :

ئەم جۆرە لەم هەرێمانە دەردەکەوێت کە قوولاَییکی شارستانی هەیە کە حکومەتە ناوەندیەکان تیادا سەری هەلداوە و جۆرێك لە ئارامی و ئاسایشبلاَوو بۆتەوەو مرۆڤیش ئارادەیەکی زۆر توانی ئازاد لە بۆچوونی کۆمەلَ و پاراستنی تاکە کەسی لێرەدا سەنتەرەکانی بە شێوەیەکی هەرەمەکی بلاَو دەبێتەوە بە بێ رێك خستن ئەم جۆرە رەنگدانەوەی سروشتی دابەش بوونی جوگرافی سەرچاوەکانی ئاو بەدیار دەکات کە سەنتەرەکانی نیشتەجێ بوون پشتی پێ دەبەستێ هەروەها بارودۆخی تۆپۆگرافی . ئاشکرایە کەوا کەم بوونی دەرامەتی زەوی و ووشکی کەش و هەوا وا لەدانیشتوان دەکات کە ئاوی ژێر زەوی بەگەر بخەن کە بیرو کارێزلە خۆدەگرێت و بە شێوەیەکی نارێکخراو بلاَوە دەبی و دانیشتوان لەو شوێنانە نیشتەجێ دەبن .وەکو تێبینی دەکرێت لە زۆرێك لە ناوچە شاخاوییەکانی ئێراق . بۆیە سەیر نییە جۆری دابەش بوون تیایدا بلاَوە بێت. (١٠)

بلاَّوو بوون زیاتر دەبێت لەو سەنتەرانەی کە رووی زەوی چـروپرەو بـەرزی و نزمـی جیاوازەهەروەها نشینگەکان زیاتر بلاَّووە دەبن ئەگەر ئـاو بەردەسـت بـوو تـا رادەیـەکی پێویست لە باران هەبوو هەروەکو چۆن لەدەشتی ( جۆما ) هەیە لە هیندستان ئەم جـۆرە نشینگانە دەرئەنجامی بەرەو پێش چوونێکی نیشتەجێی مێژووی هەیە کەلە رێگەیەوە بـیری مرۆڤ گۆرادەربارەی ژیان و جێگیر بوون و و شێوازی بـەکارهاتوو لەبـەکارهێنانی زەوی بۆیە بەرەو پێش چوون لـە ئامرازەکـان بەرهـەم هێنـان وئـامرازی کـشتوکالی وای کـرد بەئاسانی ئیش لەسەر بەدەست هێنانی رووبەری کشتوکالی بکریَ کەئەمەش هـانی بـلاَّوو بوونی نیشنگەکانیدا. (١١) بەم جۆرە لە ناوچەدەشتاییەکان .



وێنەی ( ٧ ) خانووی دێهاتی بلاَّوەبوو

٣ / نیشتەجێی کۆوەبوو :

لێرەدا نشینگەدێهاتییەکان کۆمەڵێکی رێك یاخود نارێك پێك دێنن بەلأم بەوە جیا دەکرێتەوە کە نزیکن لە یەکتری شتێکی سروشتی یەکە دەشتەکان و زەوی بەکار هاتوو بۆ کشتوکال بەتایبەتی لە ناوچەیەکی سروشتی سەخت وەکو ( چیایی ، زەلکاوی ، ناووچە ووشکەکان ،...هتد ) هەروەها لەو ناوچەی دەرامەتە هەمە جۆرەکان کە پالپشتی پەیدا بوونی ئەم جۆرە لە نیشتەجێ بوون دەکەن و زێیەکانیش لە ناوچەی ووشك و نیمچە ووشکەکان لە هەمووی راکێشترە بۆ دانیشتوان .نیشتەجێی کۆکراوە وادەئەنرێت کەلە هەموو جۆرەکانی تر باووترە و کۆنترە و دەکرێ بلێین دەگەرێتەوە چەرخی بەردینی سێیەم . هەروەها ئەم جۆرە لە نیشتەجێ بوون یەکەم دیاریدەیە بۆ نیشان دانی جیاوازی لە نێوان کۆمەلگەکان لە رووی چالاکی ئابووری یالایەنی کۆمەلایەتی . گوندەکانی دۆلی رافیدەین و نیل و سند خانەی یەکەمی بەرەو پێش چوونی ئاوەدانی مرۆیی بوو بۆ دروست کردنی شار. ( ١٢ )

بارودۆخی ئیش کردن وای لە مرۆڤ کرد کەلە گوندی گردەوە بوو نیشتەجێ بێت و لەسەر رووبەرێکی بچووکی زەوی . هەروەها پێویستی بۆ ئاو وای لێکرد کە بەکۆمەل جێگیر بێت بۆ سوود وەرگرتنی بەشدار بوون تایدا . لە ناوچ چیاکانیش کە بەتایبەتی بەرەورووی تیشکی خۆرە شوێنی گونجاوە بۆ نیشتە جێ بوون ، دانیشتوان لەم جۆرەدا لە خانووی لایەکتر دەژین گوندەکەش دووری لە کێلگەکە دەگۆرێ بە پێی جۆری کێلگەکەو شێوەی هەروەکو چۆن گوندی کۆکراوەیش جیاوازە لە رووی قەبارەو بە پێی دەرامەتی بەردەست و توانای مرۆڤ لەسەر بەکارهێنانی لە ژینگە دەست کورتەکان کە دەکەوێتە پەراوێزی بیابان مارەی خانووکانی گوند زیاتر نییە لە هەندێك خانووی بچووك لە کاتێکدا مارەی بەرز دەبێتەوە لە هەرێمە بە ئاوەکان لە دەیاها خانوو .

ئاشکراشە کە گوند دەربرینێکی رێکخراوە لەسەر جۆری ژیان کە لەوانەیە قەلەباخ بێت لە دەوری رێرەوی ئاوەکان یالەبەرزاییك و لەوانەشە دەشتەکان و زەوییەنزمەکانی

پەسەندتربێت زۆر جار ناوی گوندەکایش پەیوەندیەکانیان بەدەردەخست و دەکرێ گوندە رەسەنەکە گوندێکی هاوشێوەی هەبێت کە زۆر دوورنەبێت لێی هەندێك جار ناوێکی بچووك کراوەی لە ناوی گوندەکەی یەکەم وەردەگرێت بە گشتی لەهەر شوێنێك زەوی بە پیت لە دەشتاییەکان بەدەست بوو لەگەڵ بەرزی و نزمی لێك چوو ئەوا گوندە کەڵەکە بوو بنچینە ئەمەش دیاریدەیەکە بەتەنها لە ئەوروپا بەدی ناکرێت بەڵکو لە هەندێ ناوچەی چین و خاکی ئەڵلویس تێبینی دەکرێ .

ئەم جۆرە نشینگانە کە هەرچەندە شێوەیان جیاوازە کە بەزۆری بۆ جیاوازی کەش و هەواو جیاوازی قۆناغەکانی کۆمەلایەتی دەگەرێتەوە بەدەر خستنێکە لەسەر پێویستی بوون بۆ شوێنێك بۆ ئەنجام دانی چالاکی ئابووری کە بریتی یەڵە کشتوکاڵ و بە خێو کردنی ئاژەڵ . پێویستی هاوکاری کردن بۆ رێك خستنی ئاووکۆنترۆڵ کردنی ودەرهێنانی لە بیرەکان و ئامادەکردنی ئاوی بۆ ئەوەی زیاتر بگونجێ بۆ بەکار هێنانی ، دەبێتە مایەی کۆبوونەوەی جووتیاران و پەیدا بوونی گوندی گەورە ئاشکرایە کەوا کارە جۆراو جۆرەکانی کشتوکاڵی بە تایبەتی لەو وولاتانەی کە شێوازی کشتوکاڵی چروپر بەکار دێنێ پێویستی بەدەستی کار هەیە و ئیشی بە کۆمەڵ هانی خەڵکی دەدات بۆ ئەوەی لە گوندی کۆکراوەجێنشین بن لەبەر هاوکاری کردن وەکو چۆن تێبینی دەکرێ لە میسر وهیندستان وپاکستان و یەمەن،کە لەوێدا خەڵکی لە گوندی چەند نهۆم دەژین کەڵە ( ٣ – ٨ ) نهۆم پێك دێت و دەکەوێتە سەر زەوی کشتوکاڵی یان راستەوخۆ. بروانە وێنەی ( ٨ ). هەروەها نیوەی خانووەکانی گوند لە چین دا یەك سەقف دایان دەپۆشێ .

لەلایەکی ترەوە بەگەر خستنی زەوی و سیستەمی مولکداریەتی گشتی پێویستی ژیان لە گوندی کۆکراوە بەردەست دەخەن وەکو گوند هاوکاری کشتوکاڵی و کێڵگەی بە کۆمەڵ و کێڵگەی دەولەت.(١٣) هەروەکو قەبارەی گوند لەم جۆرەنشینگانە جیاوازی هەیە شێوەکەشی جیاوازی هەیە هەندێك جار شێوەی ئەندازەی رێك وەردەگرێ کە رەنگدانەوەی بەهای زەویەو مەترسی دانیشتوانەکەی لە بەفیرۆنەدانی زەوی چاك بۆ

خانوو کـردن ،لـه نێـوان ئـەم شـێوانەدا شـێوەی هێڵکـاری (Linear) کـە خانووەکـانی درێژدەبێتەوەبەدرێژایی رێگاکان و رووبارەکان و کەنارە ئاوییەکان ئـەم جـۆرەش فـراوان بوو دوای پێشکەوتنی هاتوو چۆی ووشکانی وەکو رێگـاو بـانی ئۆتۆمبیلـەکان و هێڵـی شەمەندەفەر ....لە نموونەکانی ئەم جۆرەش گونـدەکانی رۆخـی زێـی دیجلـەو فـورات و دۆڵی نیل.



وێنەی(٨) گوندی چەند نهۆم لەیەمەن

شوێنی گوندیش کاریگـەری زۆری هەیـە بەسـەر شـێوەو پێگـەی کەلەوانەیەشـێوەی درێژی هەبێت ئەگەر لە دۆڵێکی تەسك گەشـەی کردکـە دەورە درابێـت بەچیا یـاخود دووریەوی ئاوی هەروەها گونـدەکانهی رۆخـی زێیـەکان لـە کاتێکـدا ئـەو گوندانـەی کەلەسەر گردەکان یاخود دوورگەکان بنیات دەنرێن شێوەی چوارگۆشەیی یاخود بازنەی دەبێت لەبەر بچووکی زەوی بەکەلك هاتووبۆ دروست کردنی گونـد ئـەوەی تایبەتیـشە بەگوندەکانی بیابانی وواحات ئەوا رووبەرەکەی و شێوەکەی پەیوەستەبە سروشـتی زەوی کەدەتوانرێ ئاوی بگەیەنرێێ لە دۆڵەکانی خۆرهەلاتی ناوەراست گوندی گەورە بنیـات دەنرێ لە شێوەی نزیك لە بازنە لەوەی چوار گۆشە بێـت بـەلام بـە خێرایـی شـێوەکەی دەگۆرێـت هـەروەها قـەبارەی لەوانەشـە کاریـشی بگۆردرێـت لـەکاتی رێگـاو بـانێکی

هاتووچۆی نویّ تیایدا یاخود لەنزیکی دا . گوندی ئەستێرەی شێوەیەکی تری نشینگەکانە کەلەلایەنی لەگەل بەرزیەو نزمی هێلی کەنتۆری درێژدەبێتەوە لەبەرئارەزووی دانیشتوان لەسوودوەرگرتن لە زەوی ئەمەش تێبینی دەکریّ لە زۆربەی گوندەکانی ئەورووپای رۆژئاوا.(١٤)

شێوازەکانی کشتوکالیش رۆلێکی گرنگی هەیە لە دیاری کردنی شێوەی گوند لەو ناوچانەی کەکشتوکالی بە کۆمەلی لیّ باوە وەکو ناوەراستی ئەورووپا بۆ نموونە گوندە کەلەکە بووەکە لە شوێنێکی ناوەندی لە نێوان زەویە کشتوکالیەکان بنیات دەنرێت بۆ ئاسان کردنی بەگەر خستنی ( بەلام ئەگەر جووتیارەکە چەند پارچە زەویەکی هەبوو ئەوا بەرژەوەندی وا دەخوازێت لە شوێنێکی مەرکەزی نیشتەجیّ بێت تاوەکو بەئاسانی بگاتە زەویە کشتوکالیەکەی ) گوند لێرەدا شێوەی چوارگۆشە یان بازنەی وەردەگرێت.(١٥)

٤/ نیشتەجێی پەرشوبلاّوو:

ئەم جۆرە بەوە جیادەکرێتەوە کەگوندەکانی دوورن لە یەك و بلاّوەن لەسەر پانتایی هەرێمەکە . کە زۆرجار شێوەی نارێکی پێوە دیار دەبێت وەکو جۆری بلاّوو بەلاّم ئەوەیان زیاترەو رووبەری دابەش بوونی فراوانترە.(١٦) ئەم جۆرە زۆرباوە لە ناوچەشاخاویەکان و ناوچە ووشکەکان چونکە کەمی سەرچاوەی ئاووبیّ هێزی خاك و زۆری رووبەری ئاوی والە دانیشتوان دەکات کەلە نشینگەی دوور لە یەکتری بژین گەر هۆکاری یارمەتی دەر هەبوو بۆ دروست بوونی .لەلایەکی ترەوە بارانی زۆر هانی نیشتە جێی پەرش و بلاو دەدات بۆیە لە خۆرانییە گوندی پەرشوبلاووهەیە بەلکو بارودۆخی تایبەتی یارمەتی دروست بوونی دەدات لە کاتێك کۆبوونەوەی شتێکی ئاساییە گەر زەوی کشتوکالی بەیەکەوە نووساو هەبێت ئەوا جۆری پەرش و بلاویش گونجاوە بۆ ئەو شوێنانەی کە زەوی کشتوکالی پچرپچرە . هەروەها بەکارهێنانی بەردەوامی زەوی کشتوکالی وادەکات توانای بەرهەم هێنانی نزم بێتەوە دواتر گەران بە دوای شوێنێکی تر کە زەوی یەکی بە پیتری هەبێت بەرهەمی زیاتر بەدەست بهێنێت ئەمەش وای کرد کە یارمەتی دروست بوونی

نشینگەی دوور لەیەکتر ( متباعـدە ) یـاخود پەرشـوبلاْوو بکـات ، بروانـە وێنـەی (٩). ئەوەی یارمەتی ئەم جۆرەش دەدات هەست کردنە بە ئارامی و جێگیربوونە لە هەرێمەکە و دانیشتوان لێرەدا بلاودەبنەوە دووری نێوان گوندەکان زیـاتر دەبێـت لـە هـەر شـوێنێکی بارودۆخی گونجاوی هەبێت لە کاتێکدا دانیشتوان کۆدەبنەوە کە نائارامی و گێلە شێوێنی هەبێت و بەدەست هێنانی پاراستنی بەکۆمەل زیاتر دەبێت بۆیەش بەرگری کردن لە کـەس و عەشیرەت لە زۆر کاتدا بۆتە هۆکارێـك بـۆ دروسـت بـوونی سـەنتەری جێنـشین لـەو ناچانەی کەبنەمای پەیدابوونی نیە .



وێنەی (٩ ) دابەش بوونی پەرش
و بلاْوولـەرۆژئاوای عیراق

## هۆكارانەی كاردەكەنەسەردابەشبوونی نشینگە گوندیەكان :

نشینی رەنگدانەوەی پەیوەندی مرۆڤە لەگەل ژینگەكەی لە هەریمە جوگرافیە جیاوازەكان . بە ئاشكراش  فاكتەرەكانی ژینگە تارادەیەكی زۆركۆنترۆلی جۆری دابەش بوونی جوگرافی سەنتەرەكانی دیَ نشینی دەكات هەروەها كاردەكاتە سەر شیَوەی كەرەستەی بیناو ئەندازەیی و چاك كردنەوەی ئەو پیشانەی كەپێی هەلدەستیَ هەلبژاردنی گوند وەكو سەنتەریكی جیگیر بوون هەروا بە خۆرایی ناكریت هەروەكو چۆن دابەش بوونی وینەی ئیستاكەی بە خۆرا نەبووە ، چونكە چەند فاكتەریك كاری كردۆتەسەری وای كردووە بەم شیوە بلاوو دابەش ببیت ..ژمارەو قەبارەی دابەش بوونی جوگرافی گشتی كاریگەرە بەدابەش بوونی شوینی گورانكاری تر ، كەئەمەش لە لیكۆلینەوە جوگرافیەكاندا پیی دەگوتریت ( پەیوەست بوونی شوینی ) بۆ دیار دەكات (١٧) . بۆیەش ئەم جۆرە لیكۆلینەوانە جەخت لەسەر پەیوەستبوونی دیاردەكان و پەیوەندیەكان دەكات لەگەل لیكۆلینەوەی دابەش بوونی شوین

جوگرافیزانەكان بروایان جیاوازە دەربارەی رۆل و ئەو فاكتەرانەی كە كۆنترۆلی دابەش بوونی دانیشتوان و نشینگەكان دەكەن لەگەل ئەوەی تیمیك لە پیشەوەیان تویژەر سمپل ( E.Sepmle ) وای بۆ دەچن كە فاكتەری سرووشتی بەرپرسە لە جۆری ئەم دابەش بوونە تیمیكی ترلەوانە هینیجتون(E.Huntington) و تایلەر (Tayler)وای بۆ دەچن كە فاكتەریكی تایبەت لەو فاكتەرانە بەرپرسی جۆری دابەش بوونەكە دەكان.(١٨) لەلایەكی تر هەندیك وای بۆ دەرۆن كە فاكتەری مرۆیی تا رادەیەكی زۆر كاریگەری سروشت كەم دەكاتەوە هەردووكیانیش تیكەل بەیەك دەبن بە شیوەیەكی ئالۆز . كاریگەری فاكتەری سرووشتی دەكریَ تیبینی بكریَ لە ریگەی كاریگەری بەرزی و نزمی خاك ....هتد .

فاكتەری مرۆیی كاریگەریەكەی لە ریگەی جۆری چالاكی ئابووری و ریكخستنی كۆمەلایەتی و پلانی دانیشتوان بەدەردەخەن. (١٩)  كە وینەی هەولدانی مرۆڤ نیشان

دەدات لە ملمـلانێی سرووشت بەمەبەستی مانەوەو بەردەوام بـوون کـە دواتـر وادەکـات جۆرێکی دیاریکراو لەدابەش بوون پەیدا بێت.(٢٠)

ئاشکراشە کە جۆری دیاریدەکانی رووی زەوی و کەش و هەوا دەبێتە پەیـدا بـوونی بەهای شوێنی جیاواز لە شوێنەکان کـە سـەنتەرەکانی نیـشتەجێ بـوونی لەسـەر بنیـات دەنرێـت و کـە مـرۆڤ گونجاوترینیـان دەگرێتـە ئەسـتۆ بـۆ ئـەوەی ببێتـە سـەنتەرێکی جێگیربوونی . جیاوازیو هەمەجۆری لە تایبەتمەنـدی سـیفەتەکانی ژینگـە خۆمالیـەکان مەرج نییە کاریگەر لەسەر پێویستی مرۆڤ بۆ کۆبوونەوە لە چەند شوێنێکی دیاری کـراو بەمەبەستی نشیتەجێ بوون بەلام گومانیش لەوە دانییەکە کاریگەریان دەچەسپێت بەسـەر هەلبژاردنی شوێنی نیشتەجێ بوون و شێوەی خانووەکانی .

زانا (متزن) هەولێ لێکۆلینەوەی دا لەسەر شیکردنەوەی جۆرەکـانی شـوێنی دابـەش بوونی نشینگەکان لە ئەوروپا وای بۆ دەرکەوت کە چر بوونەوەی یـاخود بلاوبوونـەوەی نشینگەکان دەگەرێتەوە بۆ هۆکاری رێسێی ( سلالی ) یا عدقی بەلام هەندێکی تروایان شی کردەوە سەر بنچینەی هەبوونی یا نەبوونی سەرچاوەی ئاو ئەو دەرئەنجامانەیکـە (متـزن ) بەدەستی هێنا رەنگدانەوەیەکی گەورەی هەبوو لـە نێوان جوگرافیەکان وبیرورِاکـانی تـاکو ئەمرۆش بنەرەتێکی چەسپاوە لـە رێگەکان و شێوازەکانی چارەسەر کردنـی جـێگیر بـوون هێنایە کایەوە هەروەها شی کردنەوەی جۆرەکانی .

رەهەندی مێژووی کاریگەری هەیە بەسەر دابەش بوونی دێ نشینی چـونکە جۆرەکـانی ئێستای و ئەو گۆرانکاریانەی بەسەری هات شی بکرێتـەوە بـەبێ چـوونە سـەر پاشـکۆی مێژووی ناوچەی لێکۆلینەوە بۆیە پێویستە کاتی ئەم جۆرە لێکۆلینەوانـە دەکـرێ راسـتیە مێژوویەکانی پەیوەندار بەدەست بهێنرێ .(٢١)

لە ژێررۆشـنایی ئـەوەی ووتـرا تێبینـی ئـەوەدەکرێ کـە دابـەش بـوونی جـوگرافی دانیشتوانی دێی و نشینگەکانی بەردەوام لە جوولە دایە و هۆکاری کاریگەر بەسەریەوە

جیاوازە .. بەپێی شوێن و کات دەچێتە ژێر کاریگەری ژمارەیەك فاکتەرو گۆرانکاری وەلەهەمووشیان کاریگەرتر :

یەکەم/ فاکتەری سرووشتی :

ئەم فاکتەرە رۆلێکی تایبەتی دەگێرێ لەوێنەکێشانی دابەش بوونی جوگرافی سەنتەرەکانی دێ نشینی جیاوازی لە دیاریدەکانی رووی زەوی ورەگەزەکانی کەش و هەوا دەبێتە مایەی پەیدا بوونی بەهای شوێنی جیاواز گومانیش نییە کە ئەم جیاوازیانە دەبێتە مایەی جیاوازی ئەو شوێنانەی کەنشینگەکانی لەسەر بنیات دەنرێت مرۆڤیش لێرەدا باشترینیان هەلدەبژێرێت بۆ ئەوەی ببێتە سەنتەری نیشتەجێ بوونی . بلاوبوونەوەی لەسەر زەوی بە شێوەیەکی بە دوای یەکدا دەبێ کاتێك دیاریدەکانی رووی چروپرتر دەبێت و جیاوازی دەبێت لە کاتێکدا نشینگەکان دەگاتە ئەوپەری گردبوونەوەی لە دەشتەکان ، هەروەها کەمی سەرچاوەکانی ئاوو خراپی خاك و زۆربوونی زەلکاوەکان و دارستانەکان وادەمات کە گردەوە بوونی گوندو کۆبوونەوەی بەرفراوانی وگەورەی نەیەتەدی والە دانیشتوان دەکات هەندێك جار بەرەو بلآووە بوون برۆن لە نشینگەکەی دوور لەیەکترو دابراو... لە دێرەکانی داهاتووش فاکتەرە سرووشتی یەکان دەخەینەروو لە رێگەی کاریگەریەوە بەسەر نشینگەکان ،کەئەمانەن :-

١ - کاریگەری بەزی و نزمی :

پەیوەندیەکی پێچەوانە هەیە لە نێوان بەری و سەنتەرەکانی نیشتەجێ بوون و ژمارەی دانیشتوانی ، لە کاتێکدا نیوەی تێکرایی دانیشتوانی جیهان لە ئاستێکی بەرزی کەمتر لە ( ٢٠٠م ) دەژین لە رووی دەریاوە ٩/١٠ دانیشتوان لە ئاستێکی کەمتر لە ( ٤٠٠م) دادەژین لە جیهان دا. (٢٢)

مرۆڤ هەر لە کۆنەوە دەشتاییەکان و بەرزی ونزمی بەسەر چیاکان و زەوییە سەختەکانی پەسەندتر کردووە لە روانگەی کە ئەوەی یەکەمیان ملکەچ تر شێوازەکانی

ئاودێری ڕێکخراودامەزراندنی سەنتەری نیشتەجێ بوون و دروستکردنی ڕێگاو بانەکان و هاتووچۆ کردن ،هەروەها دەشتەکانی ناوچەی چیاییزیاتر دانیشتوان ڕاکێشێ بۆ خۆی لەگەڵ بناری چیایی تەخت و پێشەنگی چیایەکان چونکە باشترین شوینە بۆ بەکار هێنانی کشتوکاڵی و دامەزراندنی نشینگە بەربەستەکانی نیشتەجێ بوون لە شوێنەبەرزو سەختەکان بریتیە لەلایەنی سروشتی و ژینی مەبەستمان لایەنی سروشتی نزم بوونەوەی پلەی گەرمی هەرچەندە بەرز بووینەوە بەلام ڕادەی باران زیاد دەکات تا ئاستێکی دیاری کراو دەروات بەفر دەبارێت جگە لە بەرز بوونەوەی پالە پەستۆی هەوا بەبەرز بوونەوە کەدەبێتەوە مایەی لەیەك خستنی توانایان مرۆڤ لەسەر جوولە ، لەیەنی ژینیش پەیوەستە بەبەرهەم هێنانی خواردن بەرزی و نزمەرووبەروی کشتوکاڵی سنووردار دەکات یاخود بەرەو پێشبردنی قورس دەکات.(٢٣) بۆیە زەوی سەخت ڕۆلی خۆی دەگێرێ بەبەست کردنی گەیشتنی دانیشتوان بۆی ئاوەدان کردنەوەی یا چاندنی و دروست پێکهێنانی تیایدا.(٢٤)

لەلایەکی ترەوەلەوانەیە چیاکان هەندێ جاربێتە هەرێمێکی کۆبوونەوە دانیشتوان لەبەر سەختی زەحمەتی گەیشتن پێ ی کاتێك مرۆڤ پەنا بۆ ئەو شوێنانە دەبات کە دەپارێزێت لە دوژمنان یان کاری بەرگری کردنی ئاسان دەکات یاخود لەوانەیە ئەو شوێنە بارانی زیاتر بێت یا دەرامەتی سروشتی چاکی تایایە هەروەها دانیشتوانی ناوچەگەرمەکان بەرزایەکانیان لەلاپەسەند ترە بۆ نیشتەجێ بوون بە پێچەوانەوە دانیشتوانی ناوچەساردەکان کە دەرکردە لە ناوچە مام ناوەندیەکانیش بەرزی و لەسەر رووی دەریاوە چالاکی مرۆڤ دەست نیشان ناکات بەلکو نزم بوونەوەی پلەکانی گەرمی و کەم بوونی دەرامەتی کاریگەری تیادەکەن پێش بەرزیو نزمی سەرەرای ئەوەی کە چیاکان لەم جۆرە شوێنان بە زەوییەکی کشتوکاڵی حەدی دادەنرێت بۆیە بەهای بازرگانی کەمتر دەبێت لە بەهای زەویە نزمەکان کە ئەمەش وادەکات لە رووی دانیشتوانەوە ناتەواو بێت.(٢٥) لەگەڵ ئەوەشدا لەوانەیە تێبینی سەنتەری جێگیر بوون بکرێت لە

دەوری چیاکان وەکو لە یابان یان لەگەڵ بلابوونەوەی کانیاوەکان لە موقەدیماتی چیاکان وەکو لە ناوچەکانی ئەلبیقاع لە لوبنان.(٢٦)

هەروەها دەکرێ تێبینی ئەوەبکرێ لــە وولاتـانی دەریـای ناوەراسـتەوە وەك جـەزائیرو تورکیـا و یۆنـان و بـەلقان هـەروەها لــە عێـراق و ئێـران کەبـە زۆری گونـدەکان لەسەرلێژێکی دوور لە زەوی کشتوکاڵی بنیات ئەنرێت و لەوانەیە کەلەکە بـوونی زیـاتر بێت لە ناوچە کاندا بەبەراوورد لەگەڵ نزیك چیاکاندا.(٢٧)

لە ژێر رۆشنای ئەوەی کەووترا دەبینین کەبەهای ژینگەکان بەتەنها سیفەتی شێوەی وێنەی بەرزی و نزمە بەدیار ناخات بەلکو تایبەتە مەندی هەمەجۆری تریش هەیـە دیـاری بکـات چیاکان بەگشتی ناوەندێکی لێك چوونییە بەلکو جیاوازی شوێنی دیاری هەیـە لــە نێـوان موقەدیمات و قەدپالی چیاکان لەلایەکی ترەوە لەگەڵ لووتکەکان و دۆڵــەکان لەلایـەکی ترەوە لــە نزیـك موقەدیماتــەکان دەهەــەرێمی لێـك جیـاواز بەیـەك دەگـەن . چـیاکات رووبەری دەشتایی کەئەمەش لەخۆیدا هانی دانیشتوان دەدات کە رۆلی بازرگـانی ناوەنـد ببینن پالپشتی بنیات نانی سەنتەرەکانی نیشتەجێ بوونی تایبەتی دەداتگـەر شـتێك هـەبێت وابکات کە نشینگەکان لە ناوچەی سەخت و دژوارەکان بنیات بنرێت کە دەبێتە مایـەی بەرزی تێچوونی بژێوی ئـەوا فاکتـەری ئـابووری سـتراتیژی گـرنگترین ئـەو هوکارانـەن بەگـشتی ناوچـەبەرزەکان بـەوە جیادەکرێنـەوە کەنـشینگەکانی بـچووکن لــە کاتێکـدا دەشتەکان و زەویە نزمەکان شاری گەورەلە خۆ دەگرن وە ئەگەر دانیشتوان لە چیاکاندا کەم بن دۆلەکانی ناوچەیەکی چریدانیشتوانێتی .

دۆلەکان رۆلی رێگاوبان دەگێرن بۆ چـوون نـاو ناوچەچـیاکان و شـوێنی پەسـەندی دانیشتوانی بەرزایەکانە هەروەها پلەی لێژی و ئاراستەی چیاکان پلەی بەرەو روو بـوونی تیشکی خۆر کاریگەر دە هێزی هەیە لە دیاری کردنی ناوچەکان جێگیربوونی بە درێژایی ئەو وولاتانە . لە کاتێکدا بارودۆخی تەختی زەوی بەردەست بوونی ئاووبلاوو بوونەوەی تۆری هاتووچۆو کشتوکالی بەرفراوان هانی پەیدا بوونی جۆری بلاوە بـوو دەدات بـەلام

دیاریدەی بلاو بوونی زۆنگ زەلکاوەکان کاریگەری بە هێزی هەبوو لە دیاری کردنی شوێنی نشینگەکان لە دەرئەنجامی ئەو ئاستەنگانەی رربەرووی مرۆڤ دێتەوە لە کاتی هەلبژاردنی شوێنی گوندەکە بۆیەش دەبینرێت لەو ناوچانەیدا کەسەنتەری نیشتەجێ بوون دیاری کراو هەیە کە دانیشتوانی کۆ دەکاتەوە و کشتوکال کردن و بە خێو کردنی ئاژەل و راو کردنی ماسی تیادا ئەنجام دەدرێت ئەوەش ماوە بلێین کە چالاکی مرۆیی لە ناوچەبەرزەکان ، دەچێتە ژێر کاریگەری زیاتر لە کاریگەری بەرزی سەرباری سروشت زەوی تەنك و رووتاو و زەحمەتی بە کار هێنانی کشتوکال تیلیدا بەکارهێنانی ئامرازو ئامێری کشتوکالی لە کاتێکدا مرۆڤ لە ناوچە بەرزەکان لە نزمایی دۆلەکان بژێت . هەروەها قەدپالی چیایی زۆر کەمترسەرنج راکێشترە بۆ دانیشتوان لەو پال چیایانەی کە لێژی یەکەی کەمترە یان پلەپلەیە هەروەها ئەو ناوچانەی کە رووبان تەختە و هەرچەندە بەرزیش بێت ئاراستەی چیاکان و درێژ بوونەوەی بەرزی و نزمی کاریگەری هەیە بەسەر شوێنی گوندەکان و قەبارەیا ن و ژمارەیان لە رێگەی پەیوەندی بە رادەی باران و گوشەی تیشکی خۆر و ئاراستەی باکان .

لە کاتێکدا کە لێژی کەم بێت و دەشتی تەختە بەردەست دەبێت بۆ کشتوکال کردن لێرەدا کردنی کشتوکال پلەپلە ( مدرجات ) لە پالچیاکان توانای نیشتە جێ بوونی ناوچەکە زیاتر دەکات بەتایبەتی ئەگەر بەرەو رووی رۆژ بوو چیاکان پارێزی دابین کرد بۆیان لە کاریگەری با .

٢ – کاریگەری کەش وهەوا :

رەگەزەکانی کەش و هەوا رۆلێکی تایبەتیان هەیە لەلایەن کاریگەریان بەسەر جۆری دێ نشینی ئایا ئەم کاریگەریەش بە شێوەیەکی راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ بوو لە کاریگەری دیاری کردنی ئەو ناوچانەی کەلە بارە بۆ جێگیر بوونی مرۆیی . شوێن بە گوێرەیی بازنەکانی پانی و پلەی بەرزی لەسەر ئاستی رووی دەریاو رووبەرە ئاویەکان ، لە رەگەزەکاریگەرە پێشکەووتوەکان دێن بەسەر سەنتەرەکانی نیشتەجێ بوونی لادێی ،

نزم بوونەوەی چری دانیشتوان لە شوێنە ساردو بیابانییەکان و لە ناوچەی یەکسانی دەگەڕێتەوە لە بنەرەت بۆ زەحمەتی ژیان لە ژێر بارەدۆخی ئاووهەوای ئەو ناوچانە ، کە ئایا ئەم زەحمەتییەلەلایەن بەرهەم هێنانی کشتوکال بێت یان بنیات نانی نشینگە لە کاتێکدا کە ئەم ناوچانەی کە ئاووهەوای مام ناوەند بارانی بە پێی پێویستە لە ناوچە گرنگەکانی کۆبوونەوەی دانیشتوانە لە جیهان . گومان نیە کەدانیشتوانی ناوچە ووشکەکان ناتوانن جێگیر بن و نشینگە بنیات بنێن ئەگەرسەرچاوەیەکی غەیری باران بەدەست نەبێت لە کاتێکدا دانیشتوانی ناوچە شێدارەکان دەتوانن لەهەرشوێنێکی بیانەوێ جێنشین بن ئەگەر بەرزی و نزمی ڕێگە بدات چونکە بارانی پێویست هەیە بۆ دەستەبەر کردنی پێداویستی یەکانیان و ئەنجام دانی کاری کشتوکالی بە شێوەیەکی گرنتی ، بۆیە باران ڕۆلێکی گرنگی هەیە لە رووی رادەی دابارین و کاتی دابارین . لە وێنە کێشانی جۆری دابەش بوونی نشینگە لادێیەکان قەبارەی دانیشتوان وەئەگەر هاتوو لەهەر شوێنێك ڕۆلێکی هەبوو لە جۆری دابەش بوونی چری و نشینگە لادێیەکان لەناوچە بەرزەکان لەبەر زۆری بۆ کشتوکال کردن ئەوا وەرزی دابارین لەلایەکەوە بوونی وەکو سەرچاوەیەکی گرنگی ئاوی ژێر زەوی لەلایەکی ترەوە وادەکات هەر ڕۆلێکی ناراستەوخۆی هەبێت لە دابەش بوونی ئەم نشینگانە . ئاشکراشە کە ناوچەی ووشك و نیمچە ووشکەکان لەو شوێنانە کە دانیشتوان بەزۆری ئاگاداری ئەوەن کەلە تەنیشت سەرچاوەیەکی ئاوی جێگیربن بە تایبەتلەو دەشتانەی کە زێی بەردەوامی تیایدادەڕوات و توانای کشتوکالی بەرز دەبێت بۆ دابین کردنی خۆراك بۆ دانیشتوان بۆیەش نشینگەکان زیاتر کەلەکە بوودەبن لەو شوێنانەی کەسەرچاوەی ئاوی‌کەمە بۆیە سەیر نییە کە ئاو ڕۆلێکی یەکلاکەرەوە بگێڕێت لە جۆرو دابەش بوونی نشینگە لادێیەکان و هەروەها لە ژمارەو قەبارەیان دەکرێ بلێین کە جۆری کۆبوونەوە لە نشینگەکان بە زۆری تایبەتە بەو ناوچانەی کە بارانی وەرزییە. لە واحاتی ناوچە ووشکەکانیش لە شوێنە گرنگەکانی خربوونەوەی دانیشتوانە ، لە کاتێکدا جۆری بڵاوو باوە لەو ناوچانەی کە بارانی دابەشە بەسەر هەرچوار وەرزەوە .

٣ - سەرچاوەکانی ئاو :

پەیوەندی نێوان دابەش بوون و رادەی سەرچاوەی ئاو لەگەڵ دابەش بوونی نشینگە لادێیەکان و قەبارەیان لە هەموو دیاریدە جوگرافیەکان دیارترە بەلام لەگەڵ ئەوەشدا رۆڵی ئاو لە بلاوە بوونەوەو چڕ بوونەوە زیارترە لە ناوچە ووشکەکان یان کەم ئاوەکان لە کاتێکدا ئەم پەیوەندیە ئەوها نیە لە شوێنە شێدارەکان کەمرۆڤ دەتوانێ ئاو هەلبگرێت و عەمباراوی بکات بکات تاکاتی پێویست بەکاری بهێنێت . سەرچاوەکانی ئاو شوێنی گوند دیاری دەکەن چونکە دەبێ ئاو بەردەست بێت بۆ کشتوکال کردن و خواردنەوەو بەکارهێنانەکانی تر هەروەها رادەی ئاو رووبەری دیرای دەکات لەگەڵ ژمارەی دانیشتوانی چونکە لەگەڵ زۆر بوونی کانیاو سەرچاوەی ئاوی گوند زۆر دەبێت و ماوەی نێوانیان کەمتر دەبێت . شتێکی سرووشتیە مرۆڤ شوێنی جێگیربوونی لە نزیك رووبارو دەریاچەو سەرچاوەی تری ئاو هەڵبژێرێ و هەروەها زۆری ئاوی کانیاوو بیر دەکرێ وەکو بەدیلێکی ئاوی سەر زەوی بێت و دانیشتوان لە دەوری کۆ ببنەوە. بۆ وەدەستهێنانی ئاو مرۆڤ زۆرجار لەزەویە نزمەکان یا ناوچە دورگەییکان یا ئەو ناوچانەی کەبەرەو رووی لافاودەبێت جێنشین دەبێت ، لەپاڵ گرنگی ئاو بۆ مەبەستی ماڵی یان بۆ ئاژەڵ و گواستنەوە.

بەهەر حاڵ دەشتی دەوڵەمەند بەسەرچاوەکانی ئاو ، باشترینیانە لەبنیاتنانی نشینگە دێهاتیەکان،چونکە توانای کشتوکالی بەرزە لەبەدەستهێنانی خواردن بۆ دانیشتوانی . بۆ نموونە لە وولاتی میسر گوندەکان چرووپڕ دەبنەوە بە دانیشتوان بەدرێژایی رووباری نیل و لقەکانی هەروەك هەردوو رووباری دیجلەو فوراتیش لە عێراقدا. بەڵکو لەوەش زیاتر زۆرجار هەبوونی ئاو گرنگی زیاتر دەبێت لەسەختی کەشووهەوا لەوێنەکێشانی شوێنی نشینگەکان ، بۆ نموونە لەچیاکانی ئەلقەلموت لە سوریادا ، دانیشتوان کۆ دەبنەوە لەنزیك کانیاوەکان بەبێ گوێدانی زۆر بەسەختی کەش لەزستاندا .(٢٨) لەفەلەستینیش نشینگەکان جیاوازن لەرووی قەبارەو جۆری دابەشبوونی ، لەبەر سروشتی

سەرچاوەکانی ئاو تیایدا . ئەو گوندانەی کەلەبناری خۆرئاوای بانی فەلەستیندان، زۆر ولەنزیك یەکترن، بەلام ڕووبەرو دانیشتوانی کەمە . لە کاتێکدا گوندەکانی باشوری فەلەستین بەوە جیا دەکرێنەوە کە ژمارەیان کەمەو لەیەك دوورن، لەبەر کەمی سەرچاوەی ئاوو ووشکی ناوچەکە.(٢٩)

کەمی ئاو لە ناووچە ووشکەکان وا دەکات دانیشتوانی کۆ ببنەوە لە دەوری سەرچاوەکانی. ئاشکراترین نموونەش واحاتی بیابانە، لەکاتێکدا دەرفەتی بلاّووبونەوە لە ئارا دەبیّ بەبیّ ئاستەنگ لەو ناوچانەی کە ئاوی زۆرە . بەلام لەگەلّ ئەوەشدا مەرج نیە هەموو ڕووبارێك دانیشتوان ڕاکێشیّ بۆخۆی، چونکە هەندێکی ڕۆخەکانی نقوم دەبیّ لە کاتی بەرزبوونەوەی ئاستی ئاووهەندێکی ئاستی زۆر قولّە یاخود دۆلّی زۆر تەسکی هەیە یا زۆر فراوان کە دەبێتە ئاستەنگ لەبەردەم بەکارهێنانی . لە ژێر توانا ئاساییەکاندا و لەو کاتەی کە مرۆڤ بەردەوامە لە ململانیّ لەگەلّ ژینگەکەیدا بۆ زالّ بوون بەسەر کەمی ئاو لەڕێگەی دروستکردنی بەربەست و عەمبارادو پرۆژەی ئاودێری تر، بەلام لەگەلّ ئەمەشدا، ئەم جۆرە ململانێیە تاوەکو ئێستاش هەر لەسەرەتاکەیتی .

دیاردەی هاوسەنگی لەنێوان توانای سەرچاوە ئاوییەکەو قەبارەی گوندەکە بەئاشکرایی دیار دەبێت تاوەکو ئەم سەرچاوەیە بنچینەی دامەزراندنی بێت. ئەمەش هەندێك جار وا دەکات کەکۆمەلێك لە دانیشتوانی گوندەکە جێی بهێلّن لەبەر زۆری ژمارەیان یاخود کەمی دەرامەتی ئاوو لەشوێنێکی تری نزیك گوندەکەیان جێگیر دەبن. دەکریّ ئەم شێوەیەش لە ناوچەی زۆری وولاّتە عەرەبیەکان و جیهان دیقەت بدەین . زۆرجار قەبارەی دانیشتوانی گوندێك زیاد دەکات ، لێرەدا کۆمەلێکیان ناچار دەبن کە جموجۆلّ بکەن بۆ ئەوەی لە نشینگەییکی تازەی نزیك لەوی یەکەم جێگیر بن ، لەوانەشە هەر ناوی گوندە ڕەسەنەکەی لیّ بنریّ لەگەلّ زیادکردنێك کە جیای بکاتەوە لێی.(٣٠)

**دووەم / فاکتەری ئابووری:**

لە پاڵ فاکتەری سرووشتی کاریگەر بەسەر دابەشبوونی نشینگەدێهاتیەکان ، تێبینی دەکەین کە فاکتەری ئابووریش زۆرجار لە پێشەنگی ئەو فاکتەرانە دێت کە بڕیار لەسەر شوێن و قەبارەی ئەم نشینگانە دەدات . ئاشکراشە کە ڕۆڵی مرۆڤ و تواناکانی و شێوازی سوود وەرگرتنی لە زەوی وئەوەی پەیوەستە پێوەی ، زیادکردنی گرنگی هۆکارێکە یا چەند فاکتەرێکی مرۆیی کە ڕەهەندێکی کاریگەر دەسەپێنیتە سەر دابەشبوونی دانیشتوان و نشینگەکان . فاکتەری مرۆیی ڕۆڵی خۆی بە ئاشکرایی دەبینێ لە ڕێگەی دابین کردنی ئاستی پێویستی گونجاندن لەنێوان پێگەی گوند و شێوازی بەکارهێنانی زەوی یاخود جۆری بەرهەمهێنان ، چونکە جۆری پیشەو شێوازی بەرهەمهێنان و ئامرازەکانی وەبەرهێنان و پەیوەندییکانی بەرهەمهێنان و جۆری مولکداریەتی و ڕێگاکانی ئاودێری .... کاریگەری خۆی هەیە بەسەر توانای زەوی بۆ بەخێو کردنی دانیشتوان . ئەمەش ژمارەو قەبارەی نشینگەکان دیاری دەکات لەگەڵ پلەی گەشە کردن و بەرەو پێش چوونی ، هەروەك چڕی دانیشتوانی سەنتەرەکانی جێنشینی زیاد دەکات گەر لەپیشەی کۆکردنەوەی خۆراك و ڕاو بۆ پیشەی بەخێوکردنی ئاژەڵ و کشتوکاڵ و پیشەسازی بڕوات.

لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکان یا ئەوانەی کە پشت بە ئابووری سرووشتی(الاقتصاد الگبیعی) دەبەستن ، کاریگەری مرۆڤ بەسەر ژینگەی لاوازە . ژماەو قەبارەی سەنتەرەکانی جێنشین کەم دەکات هەروەکو باسمان کرد . بەتایبەتی لە کۆمەڵی کۆکردنەوەی خۆراك و ڕاو لەئەفریقیاو هیندیە سوورەکان لە ئەمریکاو ئوستڕالیە ڕەسەنەکان لە خۆرئاوای ئوستڕالیا. لەگەڵ ئەوەی پیشەی بەخێوکردنی ئاژەڵ دانیشتوانی زیاترە، بەلاّم بە بەراورد لەگەڵ کشتوکاڵ کەمە ، کە تیایدا دانیشتوان پەیوەست دەبن بەزەوی و چڕی دانیشتوانی زیاد دەکات هەرچەندە ئامرازەکانی تەکنیکی کشتوکاڵی بەرفراوانتر بووُ . چونکە هەرچەندە ئاستی گۆمەڵگەی کشتوکاڵی بەرزبێتەوە لەلایەن

پێشکەوتنی تەکنیکی و خوتەرخانکردن بوچڕکردنی کشتوکاڵ ،ئەوا چڕی دانیشتوان بەرزتردەبێت . هەروەك چوّن دەگاتە ئەوپەری بەرزی لەچالاکیەکانی پیشەسازی و بازرگانی ، لەلایکی تر ەوە بوژانەوەی ئابووری زوّر جار رەنگدانەوەی بەسەر سیستەمی دابەشبووان نشینگەکان دەبێت . هەروەها بەردەست بوونی زەوی لەبار بوّ کشتوکاڵ فاکتەرێکی گرنگە لەکاتی هەڵبژاردنی کوّمەڵێك بوّ شوێنێکی دیاریکراو – بەتایبەتی لەدێهاتەکان کە کشتوکاڵ بنچینەی ژیانی ئابووریتی– بوّ ئەوەی بکرێتە سەنتەرێکی جێگیربوون .لەکاتێکدا رووبەری تر بەلاوە دەنرێ لەسەر بنچینەی کە سوودی کەمترە بوّبەگەرخستنی کشتوکاڵ . دانیشتوان لەناوچە کشتوکاڵیە بچووکەکان ، هەروەها هەوڵی ئەوە ئەدەن کە زەوییە خراپەکانی نزیك ،بکەنە شوێنیك بوّ بنیاتنانی خانوویان بوّ سوودوەرگرتن لە زەوی لەبار بوّ کشتوکاڵ .

دەکرێ بڵێین کشتوکاڵکردن – وەکوبنچینەییکی سەرەکی ئابووری دانیشتوان– تایبەتمەندێکی گرنگی هەبوو لە وێنە کێشانی ئاراستەکانی نیشتەجێبوون، لە رێگەی ئەو سەرچاوە ئاویانە و جوّری و رادەی ،یا شێوازی کشتوکا ڵکردن و جوّری بەرهەمهێنان و موڵکداریەتی زەوی و رێگاوو بانەکان .

١ – موڵکدارێتی زەوی :

گومان نیە کە یاسا و دامەزراوە کشتوکاڵیەکان و جوّری پەیوەند یەکانی بەرهەمهێنان ، روڵێکی بنچینەیی هەیە لەپەیداکردنی دیاردەی تایبەتی لە نیشتە جێ بوون . یاساکانی رێکخستنی زەوی لە وولاتانی عەرەبی ئامانجی چەسپاندنی موڵکدارێتی کشتوکاڵی ومافەکانی دەستیوەردانی زەوی بوو ، کەئەمەش وای کرد بەدووەکان و شوانکارەکان جێگیر بکات و جموجوڵیان کەمتر بکات. ئەمەش وایکرد کە ژمارەیێکی تازەی نیشنگەکان پەیدابێت و ژمارەی دانیشتوانی هەندێکی تری زیادبکات .

لەلایکی تر ئەم یاسا کشتوکاڵیانە لە زوّربەی وولاتانی جیهان وای کرد کە سەرکردەوە و گەورە پیاوانی هوّزەکان رووبەری کشتوکاڵی فراوانیان بەدەستکەوێت و

بەناوی خۆیان تۆمار بکەن ، کە ئەمەش ژمارەییکی زۆری جووتیارانی بێ بەش کرد لە زەوی وناچاریانی کرد بە دوای سەرۆك هۆزەکان بکەون و لەژێر سێبەری ئەوان بژین و سوود لە پاراستنی وەرگرن کە ئەمەش بووە مایەی پەیدابوونی کۆبوونەوەو گوندی گەورە .

لەکاتێکدا ئەو هەرێمانەی مولکداریتی کشتوکاڵی گەوریان هەیە بەوەجیا دەکرێتەوە کەژمارەی نشینگەکانی کەمە و مەودای نێوانیان زۆرە . لەلاییکی ترە ئەو هەرێمانەی کە مولکداریتی بچووکیان هەیە بەوەجیادەکرێتەوە کە گوندەکانیان چرترە و ژمارەی دانیشتوانی زیاترە و مەودای نێوانیان کەمە . ئاشکرایە باووبونی مولکداریتی بچووك مانای فراوان بوونی قەبارەی نشینگەو چڕبونەوەی بەشێوەییك کەوا نیشان دەدات گوندەکانی لێك نزیکن ، ئەمەش دانیشتوان ناچاردەکات کە بەرهەمهێنانیان بەرەو شێوازی کشتوکاڵی چڕ ئاراستە بکەن و جۆرێك لە بەربووم بچێنن کە دەستی کاری زۆری بوێ .

دیاردەی نیشتەجێی پەرتوو بلاو کاتێك بە دیارکەوت کە یاساکانی چاکسازی کشتوکاڵی لە زۆرێك لە ولاتانی جیهان پراکتیزکرا .لە ئەوروپای خۆرهەلات بۆ نموونە ، ئەم جۆرە یاسایانە رۆلێکی سەرەکی هەبوو لە بە دیارخستنی جۆری بلاوو یا پەرتوو بلاو لە نیشنگەکان هەروەها کێلگەی تاك . بە کوتا هاتنی رۆلی دەرەبەگیش هۆکارێکبوو بۆ پەیدابوونی مولکداریتی بچووك و دواتر پەیدابوونی گوندی بچووك یا دابڕاوو .

زانا (متزن) ئاماژەی بە پەیوەندی نێوان کشتوکاڵی تاك و نشتەجێی پەرتوو بلاو کرد،کاتێك لێکولینەوی لەسەر کێلگەی کراوە Open Field کرد .(٣١)

گومان لەوەدانیە کە بنیاتنانی کێلگەی کۆکراوە هەنگاوێکی سەرەکیە بۆ بوژاندنەوەی کشتوکالو بەرەو پێش بردنی وزۆربەی ولاتانی ئەوروپا پەیرەوییان کرد ، بۆ نموونە لە فەرەنسا ئامانجی پرۆسەی کۆکردنەوەی کێلگەکان و لابردنی سنوری

نێوانیـان ، چـاکترکردن و بوژاندنـەوەی بـەرهەمهێنانی کـشتوکاڵی بـوو ، دەوڵـەتیش بەشداری ئەوەی کرد .لە کاتێکدا ئیتالیا بەوە تایبەت بوو کە کێڵگەکانی پەرشوو بڵاوە هەروەك خانووەکانیش دواتر پەیڕەوی پرۆسەی کۆکردنەوەی جووتیارانی کرد لە یەکەی چوارینی هاوبەش لە ناوەراستی کێڵگە کـشتوکاڵیەکان،ولاتی هوڵەنـداش هـەمان شـتی کرد .(٣٢)

٢- شێوازی بەکارهێنانی زەوی:

شێوازی کشتوکاڵکردن وڕێگاکانی ئاودێری کاریگەری خۆی هەیە بەسەرشێوەی نشینگەکان وجۆری دابەشبونیان.گەرمرۆڤیش یەکەم شوێن کە ئاوەدانی کردبێت ناوچەی تەخت و دەشتاییەکان بووە، ئەوا بەکارهێنانی ئامێرو ئامرازی کشتوکاڵی گرنگی ئەم شوێنانەی زیاتر کرد،بۆیەش لەکۆنەوە تاوەکو ئەمرۆشی لەگەڵدابێ گەورەترین نشینگە دەگرێتە خۆو لە رووی قەبارەوەو زۆرترین نشینگە لەرووی ژمارەوە ،لێرەدا تێبینی دەکرێ دانیشتوان کۆبوونەوە لە کشتوکاڵی بەکۆمەڵ کەجوتیارەکان ئارەزووی هاریکاریکردنی یەکدی دەکەن لە بەکارهێنانی ئامرازو ئامێری کشتوکاڵی هەروەك هاوکاری یەکتر دەکەن لە چاندنی زەوی .لە لایکی ترەوە شێوازی نۆرەپێکردن (اسلوب التبویر) پەیڕەو کراولە کشتوکاڵی زستانە بە مەبەستی پاراستنی بە پیتی زەوی ،وادەکات کە بەرهەمهێنان نزم بێتەوە و دواتریش کاردەکاتە سەرداهاتی جووتیار .بەلاّم لە هاوین لەبەر پێویستی بوون بۆ زەوی کشتوکاڵی کە دەکرێ ئاوبدرێ جووتیار ناچار دەبێت هەمووی بەکاربهێنێ.ئاشکراشە کە ئەم بارودۆخە لەپاڵ نەگونجانی زەوی سەخت بۆ بەکارهێنانی ئامرازی کشتوکاڵی لە بەرزاییەکان وناوچە بەستەڵەکیەکان ولە ناوچە زۆنگ زەلکاوەکان،وای کردووە کەتوانای زەوی سنوورداربێت لەبەخێوکردنی ژمارەی زۆری دانیشتوان (بۆیەش دەشتاییەکان هاندەر تربوون بۆ نیشتەجێ بوون)کە ئەمەش وای کرد نشـینگەکان بە زۆری قەبارە بچووك بن وپشت بە شێوازی تر ببەستن لەپاڵ کشتوکاڵکردن وەك بازرگانی و پیشەسازی وکاری دەستی و راوکردنی ماسی.

ڕێگاکانی ئاودێریش پەیوەندی هەیە بە جۆری دابەشبوونی نشینگە دێهاتیەکان.لەناوچە باراناویەکان کە روبەرێکی فراوان لە زەوی کشتوکاڵی پشت بە باران دەبەستێ وجۆری کشتوکاڵیش تیایدا بەرفراوانە (الزراعه الواسعه)*.لە زۆربەی کاتدا ئەم ناوچانە بەشداری پەیدابوونی جۆری پەرتووبلاوی نیشتەجێبوونی داوە،لە کاتیکدا کشتوکاڵی ئاودێری پەیوەستە بە جۆری کۆەبوولەوناوچانەی کە رێژەییکی گونجاوی ئاوی هەیە.

وەکوزانراوە زەوی ئاودراو بە ترۆمپای ئاوی وئامرازی بەرزکردنەوە ،زیاتر دانیشتوانەکەی چڕبونەتەوە لەو ناوچانەی کەبە ئاودێری بەراو(الری السیحی) پەیڕەو دەکەن. شێوەی یەکەم لە خاکی شان ڕووبارەکان(کتوف الانهار)باوە لە کاتێکدا ئەوەی دووەم لە ناوچەی ئاوەڕێژی ڕووبارەکان بەدیاردەکەوێ کە بە پێی کەمترە.هەروەها ناوچەکانی ئاودێری بەراو دانیشتوانی چڕترە لەو ناوچانەی کە پشت بە باران دەبەستن.

وا دیارە بەکارهێنانی ڕێگاکانی ئاودێری لە کشتوکاڵدا وایکردوە(هەتا سەبارەت بە سەرەتاترین شێوازی بەکارهاتوو )چڕی نیشتە جێبوونی زۆر بەرزبێت و گوندەکانیشی قەبارەیان گەورەتر بێت و زیاتر لەیەك نزیکبن و جێگیرتربن.(٣٣)گومانیش نیە کە بەرزی زەوی کشتوکاڵی لە ئاستی ئاو بە شێوەییك کە نەتوانرێ ئاودێری بەراوی تیدا بەکاربێت وا دەکات کە ترۆمپای ئاوی و ئامێری بەرزکردن وەك ئامرازێك بەکاربهێنرێ بۆ ئاودێری . لە لایکی ترەوە فراوانکردنی پرۆژەکانی ئاودێری،بەتایبەتی ئاودێری بەراو، پاڵپشتی بلاّووەبونی گوندی بچووك وپەرتی داوەبە هۆی یارمەتیدانی دابەشکردنی ئاو بەسەر رووبەریکی فراوانی زەوی، لە کاتێکدا شێوازی ئاودێری بە ترۆمپای ئاووی یارمەتی پەیدابوونی گوندی کۆکراوەی دا.(٣٤)

جۆری بەرهەم هێنانیش پەیوەندی هەیە بە چڕی وجۆری دابەشبوونی نشینگەکان لەگەڵ ئەستەمی دەستنیشان کردنی ئەم جۆرە پەیوەند یە،بەلاّم ئەمە بە ئاشکرایی دیارە لە

ژمارەیێك لە وولاتانی جیهان ،وەك كێڵگەكانی گەنم لە وویلایەتە یەكگرتوەكان،مەتات لە مەلایوّ،برنج لە دەلتا ئاسیەوییكان نموونەی ئەم شێوەیەن.(٣٥)

چاندنی برنج تێبینی دەكرێ كە شێوازی كشتوكاڵی چڕە(بە پێچەوانەی گەنم)بۆیە دەستی كار بەشی سەرەكی تێچوونی بەرهەم داگیر دەكات وخانووەكانی جووتیارانی شێوەی گوندی بەیەكبەستراو و وەردەگرێ ،زۆرجار كەلە رۆخی رووبارە سەرەكیەكان جێگیرە و شێوەییكی درێژی دەبێت لەگەڵ درێژبوونەوەی رووبارەكە كە ئاوی پێویست بەردەست دەكات و هۆكاری گواستنەوەشە.(٣٦) بۆیەش جۆری چاندنی برنج فاكتەرێكی سەرەكی و كاریگەر پێك دەهێنێ لە دابەشبوون وچڕی دانیشتوان و نشینگە دێهاتیەكاندا.(٣٧) هەروەها زۆربەی جار بەوە جیادەكرێتەوە كە نیشتەجێبوونی كۆكراوەیە و ژمارەی گوندەكانی زۆرە و مەودای نێوانیان كەمە و قەبارەی دانیشتوانی بەرزە.(٣٨)

هەروەها دەكرێ پەیوەندی زۆرێك لە ناوچەكانی بەروبوومی پووڵەكی(محاصيل نقديه) بەدەرخەین لەگەڵ دابەشبوونی كۆكراوەی سەنتەرەكانی دێ نشینی ولە هەر شوێنێك توانستی كشتوكاڵكردنی بەرزبوو وەكو دەرئەنجامێكی بەردەست بوونی زەوی لەبار بۆكشتوكاڵكردن و ئاوی پێویست بۆ ئاودێری ،گوندەكان ژمارەیان زیاتر دەبێت و قەبارەیان گەورەتر دەبێت.

٣-رێگاكانی گواستنەوە:

رێگاكانو هۆیەكانی گواستنەوە، گرنگیكی تایبەتی هەیە لەسەر پەیدابوونو بەرەو پێشچوونی سەنتەرەكانی ئاوەدانی مرۆیی بەشێوەیيكی ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆو. ئاشكراشە ئامرازی نۆیی هاتووچۆ بنەمایكی سەرەكیە بۆ هەموو ئاوەدانیەك، چونكە كار دەكاتە سەر قەبارەی نشینگەكانو توانای بەرەو پێشچوونیان. بۆیەش بڵاووبوونی دانیشتوانی هەر لە كۆنەوە پەیوەست بووە بە رێگاكانی هاتووچۆكردن، بەتایبەتی ئەو ناوچانەی كە تازە ئاوەدانكراونەتەوە.(٣٩)

ڕێگا ووشکانیەکان بەهەردوو جۆری (هێلی ئاسنیو ئۆتۆمبێل)و ڕێگا دەریاییەکان، کاریگەری ڕاستەوخۆی هەیە بەسەر بەرەو پێشبردنی سەنتەرەکانی نیشتەجێبوون. بە درێژایی ئەم ڕێگایانە چالاکی مرۆیی ڕۆڵی خۆی دەگێڕێ بۆیە سەیر نییە گەر ئاوەدانی بەدیارکەوێ بەدرێژایی ڕێگاکانی ئۆتۆمبێلو هێلی ئاسنیو ڕێگا ئاویەکان بەشێوەی هێلکاری و دەکرێ پەیوەندی ئەم جۆرە ڕێگایانە بەڕوونی دیار بێت لە زەوییە فراوانە کەم دانیشتوانەکان، کە نشینگەکان بۆ خۆی ڕادەکێشی. لەوانەیە لە ناو وولاتێکدا یا هەرێمێك نشینگەیەك بەرەو نەمان بڕوات وەك نشینگەییکی کۆن، گەر هێلی شەمەندەفەر یا ئۆتۆمبێل تێپەڕ نەبوو تیایداو لەوانەشە گوندێکی بچووك گەشە بکاتو گەورە بێت چونکە ڕێگاییکی هاتوو چۆی تیادا تێپەڕ بووە.(٤٠) لەگەڵ ئەوەی گرنگی ڕۆڵی ڕێگاکانی گواستنەوە جیاوازە لە شوێنێکەوە بۆ ئەوی ترو لەکاتێك بۆ ئەوی تر، بەڵام ئەم فاکتەرە بە هەر حاڵ هیچی کەمتر نییە لە کاریگەریکانی تری پێشوو کە باسکران. بەتایبەتی ئەم جۆرە ڕێگایانە لە بنەڕەتدا بنیات دەنرێن بۆ خزمەتکردن دانیشتوانو جێگربوونیان لە شوێنێکی دیاریکراو ئەمەش واتای پەیوەست بوونیان بەزۆری- بە هۆیەکانی گواستنەوەی گونجاو لەگەڵ گرنگی ئابووری یا ڕامیاری یا سەربازی ناوچەکەیان لە پاڵ قەبارەی دانیشتوانیو ژمارەی نشینگەکانی.

دەکرێ بلێین، ڕێگکانی گواستنەوە کاریگەری باشی جێ هێشت بەسەر هەموو کۆمەڵە مرۆییەکان، بەتایبەتی لە وولاتانی تازە پێگەیشتوو، چونکە ئاوەدانی هەر ناوچەیەك بەدوای ڕێگای گواستنەوە دەکەوێت بە بەهێزی. سروشتیە گەر ئەم جۆرە ڕێگایانە کاریگەری هەبێ بەسەر قەبارەی بەرهەمو جموجۆڵی بازرگانی چونکە بە ئامرازێکی بنەڕەتی بازاڕیکردن دا ئەنرێ وئەمەش وا دەکات گرنگیکی تایبەتی هەبێت لە ڕاکێشانی دانیشتوانو نشینگەکان بۆ نزیکی یا دەوراو پشتی، بۆ سوود وەرگرتن لە هێلەکانی ئاسنیو ڕێگاکانی ئۆتۆمبێل لە پاڵ ڕووبارەکان بۆ گواستنەوەی بەرهەمە کشتوکاڵیەکانی ڕۆژانە بۆ سەنتەرەکانی بەکاربردنیان.

ە رجار تێبینی پەیوەندی بەهێزی نێوان درێژبوونەوەی ڕێگاکانی گواستنەوەو
ژن نشینگەکان دەکرێ. ئاساییە گەر نیشتەجێ بوونی دانیشتوان بەدرێژایی ڕووبارەکان و لقەکانی وای کردبێ هێلەکانی گواستنەوە بۆ خۆی ڕاکێشی ولەلاییکی تر نشینگەکانی ناوچە پارێزراوەکان کە ئایە شاخاوییە یا دارستانە یا زەلکاوییە، دوورن لە ڕێگە گشتییەکان. هەر چەندە پەیوەندیان هەیە بەیەکەوەو بە زەوییە کشتوکاڵیەکان بەڕێگای خۆ مالی، ئەمەش لەبەر مەترسی هێرشکردن، بەلام دۆلەکانی چیای دەبێتە ڕێڕەوی سەرەکی کە دانیشتوان بەکاری دێنن بۆ گواستنەوەیان. بۆیە سەیر نییە ئەم دۆلانە ببنە شوێنێکی گونجاو بۆ دامەزراندنی نشینگەکان. بەتایبەتی لەو کاتانەی کە دەسەلاتی دەولەت لاواز دەبێت.

لەژێر ڕۆشنایی ئەوەی ووترا تێبینی دەکرێ کە فراوانبوونی تۆرەکانی گواستنەوەو جموجۆلی بازرگانی وا دەکات دانیشتوان بۆ خۆی ڕاکێشیو لە دەوری خۆی کۆی بکاتەوە دواتر بە پێی قەبارەو جموجۆلەکە و سوود وەرگرتن لێی، سەنتەری نیشتەجێبوون دادەمەزرێنی.

سێیەم/ فاکتەرە کۆمەلایەتیەکان:

نیشتەجێ بوون بە تەنها هێنانەدی پەیوەندی مرۆڤ لەگەل ژینگە سرووشتیەکەی نەبووە، بەلکو دابو نەریتی کۆمەلایەتیش ڕۆلێکی دیاری تێدا گێراوە. هەرێمی سرووشتی وەکو (تایلەر Taylor) دەبینێ لە وولاتە پێشکەوتووەکانی کە پلەییکی بەرزی ئازادی کۆ مەلایەتی هەیە، بەلای پێشخستنی شێوەییکی تایبەت بە دانیشتوانی دێهاتی دەشکێ. بەکاتێکدا فاکتەری کۆمەلایەتی لە وولاتە هەرە دواکەوتووەکان کاریگەرترە لە فاکتەری فیزیۆگرافی. هەر چەندە مرۆڤیش بەرەو پێش چوو لە پلەی شارستانیەت، دەسەلات وفاکتەری کۆمەلایەتی لاوازتر دەبێتو دەگۆڕدرێ بە گونجاندنی زیاتر بۆ بارودۆخی سرووشتی.(٤١)

دیَ نشینی ڕەنگدانەوەی کاریگەری مرۆڤ نیە لەگەڵ ژینگەکەی بە تەنها، بەڵکو کاریگەری ئایینیو دابو نەریتی کۆمەڵایەتیش ڕۆڵی تێدا هەیە، مرۆڤ هەر کاتێك لەسەر شتێك ڕاهات وا دەکات کە بیچەسپێنیو ڕێکی بخات بە یاساو بەهای کۆمەڵایەتی کە لەگەڵ بەسەرچوونی کاتدا ،دەبێتە شتێکی پیرۆزو ناکریَ بە ئاسانی بگۆڕدریَ. بەتایبەتی گەر لەلایەنی ئاینیش پاڵپشت کرابێت، بۆیەش بەرەو پێشچوونی دابو نەریتی کۆمەڵایەتی قووڵترکردنی لەگەڵ ڕۆژگاردا، لەو جۆرە ژینگانە بەر بەستێکە بۆ هەر گۆڕانێکی شێوەی دابەشبوون، ئەم دیاردەیەش وای کردووە کە دانیشتوان لە کۆمەڵی هۆزایەتی دابەش ببنو لە نشینگەی نزیك لەیەك یا لەپاڵ یەکتر جێگیر ببن.

هەندێك زانایانی کۆمەڵناس،وای بۆ دەچن کە جۆری کۆکراوە لە نیشتەجێبوونی دیهاتی سەرەتاییە، پێویستی بۆ ئارامیو ئاسایش چەسپاندویتی، هەروەها سوود وەرگرتن لە هاوبەشی کۆمەڵ لە کارو بەکارهێنانی ئامراز، بەتایبەتی کە گوندەکە یەکەیکی کۆمەڵایەتی پێك دەهێنی پێش ئەوەی یەکییکی نیشتەجێبوون بێت. لەگەڵ کزبوونی ئەم لایەنە کۆمەڵایەتیە یا بارودۆخی ئابووری گۆڕا بەشێوەییك کە گیانی کۆمەڵایەتی لاوازکرد دانیشتوانی دێهاتی شێوازیان دەگۆڕن بۆ نشینگەی پەرشوو بڵاو، لەبەر ئەوەی چەند شاڵاوی تاکە کەسی زیاتر بێت ئەوا شێوازی نۆی لەبەکارهێنانی زەوی دێتە ئاراوە کە ڕیَ خۆشکەرە بۆ جودابوونەوە لە کۆمەڵ، هەندێك پێیان وایە کە بڵاووبونی جێنشینی شێوەییك لە شێوەکانی ئازادیە. لەکاتێکدا گردوە بوونی لەگوندی بەیەك بەستراو واتای بیَ دەسەڵاتیو لاوازی توانای مرۆڤ بەدی دەکاتو ملکەچی بۆ دابو نەریتی کۆمەڵایەتی.(٤٢)

لەوانەشە چەند خێزانێکی فراوان کۆ ببنەوە لەگەڵ یەکتر بەبیَ ئەوەی پەیوەندی خزمایەتیان هەبێت، بەڵام لەژێر سێبەری هۆزیکدا کۆ دەبنەوەو لێرەدا ئەم یەکتر گرتنە لەناو هۆزەکەدا، یەکگرتنێکی خزمایەتی نییە بەڵکو ڕامیارییە، کە هەر چەندەشە نمونەی

باوی هۆزایەتی ئەوەیەکە لەسەر بنچینەی خزمایەتی هاوبەش بکرێ. بەڵام نمونەی تریش هەیە کە پشت بەهاوبەشی شوێن دەبەستێ.

لەلایەکی ترەوە، بارودۆخی سرووشت کە بەرزیو نزمیو دژواری زەوی لە خۆ دەگرێ دەبێتە مایەی دابڕانی دێ نشینی و ئەوەی ئەم دابڕاویە زیاتر دەکات باڵا دەستی ململانێی خۆ جیەتییە لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان  کە بووەتەمایەی پشت بەستن بەخۆ لەلایەنی ئابووری. بەڵام ئەوەندەی پێ ناچێ ئەم حاڵەتە لاواز دەبێت کاتێك بەشێکی دانیشتوان گوندەکە دەچنە شوێنێکی تر لەژێر کاریگەری بارودۆخی سرووشتی. بۆیە دەبینرێ کە فاکتەری جوگرافی زۆرجار یارمەتی سەرهەڵدانی گوندێکی گەورە یا هۆزێك نادات. لەوەش زیاتر ململانێ تاکە کەسی کە زۆرجار دەبێتە مایەی کۆچکردنی هەندێك لە دانیشتوانی گوندو جێگیربوونیان لە شوێنێکی تر. لەکاتێکدا کە یەکێك لە هۆزەکان وا هەستە دەکات کە ئاسایشی لەمەترسیدایە لەلایەن دەرواسیکانی کە دەیانەوێ فراوانبن لەسەر حیسابی ئەوان، ئەوا هۆزەکە جموجۆڵ دەکات بۆ شوێنی تر بەڵام لە سنوری ڕەگەزیدا، کە ئەمەش هەڵی زیادبوونی قەبارەی نشینگەکان کەم دەکاتەوە بەپێی زیادەی سروشتی دانیشتوان.

نیشتەجێبوون لە سیستەمی کێڵگەی کراوە ئەستەمە چونکە جوتیارەکانی بەکرێ گرتنەو چاندنی چەند پارچە زەوییەکی بڵاووە لە ئەستۆ دەگرن. لێرەدا دانیشتوان پەیوەست دەبن بە سیستەمی نیشتەجێبوون لە گوندی گەورە. لە لێکۆڵینەوەیەك بۆ جۆرەکانی دێ نشینی لە ئیتالیا وا دەرکەوت کە سیستەمی کێڵگەی کراوە وای کردووە کە دانیشتوانی دێهاتێ لە گوندی لەیەك نزیك کۆ بکاتەوە، کە دەچنە ژێر دەسەڵاتی مولکدارەکە بەشێوەیەکی باشتر. وە لە هەمان کاتدا پاراستنیان بۆ دابین دەکات.(٤٣)

بەرگریکردن زۆرجار، هۆکارێك بووە بۆ پەیدابوونی نشینگەی تایبەت لەو ناوچانەی کە تایبەتمەندی پەیدابوونی نییە، چونکە لە بناری چیاکان دەکرا یا بەشێوەی قەڵا یا لە پەراوێزی زەلکاوەکان یا هەتا لەناوەڕاستی. لەکاتی نەمانی ئاسایش نشینگەکان

دەکشێنەوە لەو شوێنانەی کە لەباروودۆخی ئاسایی جێگیر بوون دەچەسپێنێ (لەبەر هەبوونی دەرامەتی سروشتی) بەرەو شوێنە بەرزەکانو ناوچە دوورگەییکانو دوورە پەرێزەکان دەڕۆن. بەڵام لەگەڵ ئاسایی بونەوەی باروودۆخ دەگرینەوە شوێنی خۆیان.(٤٤)

دەکرێ بڵێین کە ئەم جۆرە گوندانە تووشی زیادبوونی دانیشتوان دەبێت لەکاتی نەبوونی ئارامی ئەمەش لەسەر حیسابی گوندی تر کە چۆل دەکرێ. بۆیە لێرەدا گوند بنیاتنراوە لە چیاکانو ناوچە بەرزەکان هەر وەك لە دۆڵەکانو دەشتاییەکان.لەوانەشە ژمارەی گوند لە چیاکانو ناوچە دوورەکان زیاتر بێت لەهەندێ کاتدا لەژمارەیان لەزەوییە تەختەکان بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا قەبارەی دانیشتوانی بەگشتی کەمترە لە هاوشێوەی لەناوچە دەشتاییەکان. لەبەر سروشتی کاری کشتوکاڵی کە زەحمەتتر دەبێت هەر چەندە زەوی دژوارتر بوو یا سەختر بوو. دەکرێ تێبینی ئەم جۆرە گوندانە بکەین لە شوێنی جیا جیای جیهاندا. بۆ نموونە لە بەرزاییەکانی حەوزی دەریای ناوەڕاستە گوندو کۆمەڵگای نیشتەجێبوونی گەورە بەدیار دەکەوێ کە لەبناری چیاییك دامەزراوە دوور لە زەوییە چاندراوەکە، لەوانەشە گردەوەتر بێت لە ژوورەوەی چیاکاندا.

شتێکی سروشتییە کە بەرقراربوونی ئاسایشو گۆڕانی ئابووری کشتوکاڵی (لەجۆری بژێوی) و کۆبونەوەی داهات لە لای کشتیار وا بکات کەخانووی تازەی نزیك لەگێلگەکانیان دروست بکەن، کەدواتر جۆری بڵاوو یان پەرشووبڵاو لەنیشتەجێبون باو دەبێت لەجیاتی جۆری گردەوبووی بەربەست کراو .مێژووش ئەوەمان نیشان دەدات کەکۆچکەرە سەرەتاییکانی جیهانی تازە لەگوندی کۆکراوە نیشتەجێبوون ،چونکە پاراستن و ئارامیان تیدا دێت هەروەها هەڵی سوود وەرگرتن لەوشتانەی کەدەیانهینا لەووڵاتی دایکەوە.

بەگشتی ،گوندەکان دانیشتوانی زیاتر دەبێت وژمارەییان زۆرتر،لەکاتی بەرقەراربوونی ئارامی وجێگیربوون وخۆشگوزەرانی، بەڵام کەم دەبێتەوە لەکاتی

بارودۆخی شەپرزەیی وناجێگیری رامیاری کە لێرەدا نیشتە جێبوون تەنها لەو شوێنانە دەبێت کە گونجاوە بۆ پاراستن وبەرگریکردن وەکو ناوچەی شاخاوی کە گەیشتن پێی ئاسان نیە .

چوارەم/ فاکتەری مێژوویی :

بارو دۆخی مێژوویی رۆلی گرنگی هەیە ، لەشی کردنەوەی چری و دابەش بوونی دانیشتوان و نشینگەکانی ، دێرینی نیشتە جێبوون یا تازەیی راستێکی زەقەو ناکرێ بەهەند وەرنەگیرێ لە کاتی شیکردنەوەی جیاوازی یا لێك نەچوونی چری دانیشتوان لە نێوان شوێنێك بۆ ئەوی تر لە جیهاندا . هەروەها بۆ شی کردنەوەی تەرزەکانی دابەش بوونیش زۆرجار دابەش بوون شوێنگەی سەنتەرەکانی نیشتە جیێ بوونی دێهاتی لە هەرێمێك یان لە ناوچەیەکی دیاری کراو وێنەیەکی نزیکی تەرزی دابەش بوونێتی لە رابردوودا بە پێی مانەوەی ئەو فاکتەرانەی کە رۆل دەگێرن لە کێشانی وێنەی دابەش بوون یان بلاووە بوونی دانیشتوان.(٤٥) ئاوەدان کردنەوەی شارستانیەتەکانی ئاسیا بەر پرسیارە لە تەرزی ئێستاو دانیشتوان هەروەها کەمی دانیشتوان لە عێراقدا هەندێکی دەگەرێتەوە بۆ ئەو شالاوی داگیر کردنەی کەلە رابردوودا بەسەر دا هاتووە . زانا هینتگتۆن(Huntington)زۆربەی سەنتەرەکانی ئاوەدان کراوی ئێستای بۆ بنچینەی مێژوویی دەگەراندەوە،وای بۆ چوو کەئەم کۆبوونەوانە تەنهالەبەشێکی بچووکی دەسکەوتێکی مێژووی مەزنە.(٤٦) لەگەلْ ئەوەش زۆرپەیوەست نییە کە قەبارەو دابەش بوونی دانیشتوان بە شێوەیەکی تەردی بگەنجێ لەگەل دێرینی نیشتەجێ بوون هەروەها مەرج نییە کەکۆنترین میللەت لەرووی نیشتەجێ بوونەوە بە چرترین دابنرێت.(٤٧)

دەبێ ئەوەش لەبیر نەکەین کە پرۆسەی تێگەیشتنی ئەو هۆکارانەی کە کاریگەرە بەسەر تەرزەکانی ئالۆزی دانیشتوانەوە ئەوها ئاسان نییە بەلکو شیکردنەوەی قوولی رەگە مێژوویەکەی و ئەو نشینگانەی گەرەکە.(٤٨) هەروەها ئەوتەکنیکەی کەلە

## سەرچاوەو پەراویزی بەشی سییەم

١- محمد حجازى ، جغرافية الارياف ،دار الفكر العربى،الكويت،١٩٨٢، ص١٩٥-١٩٧.
٢- المصدر نفسه، ص ٢٠٥.
٣- عبد الرزاق البطيحى وعادل عبدالله خطاب ،جغرافية الريف،مطبعة جامعة بغداد بغداد،١٩٨٢،ص٩١.

٤-Hagget; p.٨٨
٥-Ambrose .p; Analysis Geography in Geography, ٢nd Ed, London, ١٩٧٢.p.٢٨٤
٦-Ibid; p.٩٢-٩٥.

٧- جمال الدين الدناصورى، ص٢٣٦ .
٨- محمد السيد غلاب، البيئة والمجتمع، مكتبة الانجلو المصرية،القاهرة،ط٦، ١٩٧٥،ص ٣٩٧ .
٩- بروانة : على فؤاد احمد، علم الاجتماع الريفى، دار النهضة العربية، بيروت، ١٩٨١، ص٦٠.
١٠- خليل اسماعيل محمد، انماط الاستيطان الريفى فى العراق،مطبعة الحوادث، ١٩٨٢،بغداد ،ص١٠٥.
١١ - ڤيدال دى لابلاش،اصول الجغرافيا البشرية، ترجمة شاكر خصباك،ص٢١٩.
١٢- بروانه: محمد السيد غلاب، المصدر السابق،ص٣٩٥.
١٣- عبد الرزاق البطيحى وعادل عبدالله خطاب ، المصدر السابق،ص٨٩.
١٤- عبدالفتاح محمد وهيبة، في جغرافية العمران،دار النهضة العربية، بيروت، ١٩٧٣،ص١٩-٢٢.
١٥- عبد الرزاق البطيحى وعادل عبدالله خطاب ، المصدر السابق،ص١٦,١٩-
١٦- خليل اسماعيل محمد، المصدر السابق،ص١٧,١١٣
١٧-عبد الرزاق البطيحى وعادل عبدالله خطاب ، المصدر السابق،ص٦٣.

١٨-E.Semple; Influences o Geographical,Environment new haven, London, ١٩١١.

١٩- خليل اسماعيل محمد، المصدر السابق،ص١١٩.

٢٠-R.Ridtied; "The little community", Chicago University press, Chicago, ١٩٦٥, p.١٩

٢١- محمد حجازى ، المصدر السابق،ص١٨٩.

٢٢-Clarke; population Geography, Oxford, ١٩٧٣, p.١٧

٢٣- جمال حمدان، في العلاقة بين السكان والتضاريس، مجلة كلية الاداب، ج١،جامعة القاهرة، ١٩٧٥،ص٦١-٦٣.

٢٤-Trewartha ; A Geography of population world pattern ,Ihon Wiley sons Inc New ork,١٩٦٩p.٧٩.

٢٥- محمد عبدالرحمن الشرنوبي، جغرافية السكان،مكتبة الانجلو المصرية، القاهرة، ١٩٧٥، ص٢٠٩.

٢٦- بروانه: يسري الجوهرى ،جغرافية السكان،ص٧٨-٨٠.

٢٧-Clarke; Op.cit,p.١٩

٢٨- عبدالرحمن حميدة، جغرافية سوريا البشرية،مطبعة الجبلاوى،القاهرة، ١٩٧٠ ص٢٣.

٢٩ - محمد السيد غلاب، المصدر السابق،ص١٣٦.

٣٠-Prillon ; Human Geography, by the E.D. laborde,
London, ١٩٦٠,p.٤١٧.

٣١-Houston. J.M: Asocial Geography of Europe, London, ١٩٥٣, p٨٠.

٣٢-R.U.Cook and J.H.Jonhnsin, Trends in
Geography an Introductory survey pergamon press, Oxford, ١٩٦٩,
p.٢٢٥.

* کشتوکاڵی فراوان : بەم جۆرە کشتوکاڵە دەگۆتریت کە سەرمایەی تیدا بەکاردیت لە شیوەی ئامیرو ئامرازی پێشکەوتوو بەرهەمهێنانی فراوانەو ژمارییەکی کەمی دەستە کارەی تیدا بەکاردیت بە کشتوکاڵی سووکیش (الزراعەالخفیفە) ناودەبری کە جیاوازە لە کشتوکاڵی چرو‌پڕ (الزراعەالکپیفە) کە پشت دەبەستی بە ژمارەیەکی زۆری دەستی کار.

٣٣- كارنيه، جغرافية السكان، ترجمة حسن الخياط ومكي محمد عزيز، مطبعة العاني، بغداد،ص٤١٣.
٣٤- عدنان ابو الريحة، محافظة القادسية دراسة في جغرافية السكن، رسالة دكتوراة، القاهرة، ١٩٨٠، ص٥٥.

٣٥-Trewartha ; Op.cit,p.٢٥

٣٦ - محمد خليفة الدليمي، تباين مساحات الرز في العراق، رسالة ماجستير، بغداد، ١٩٧٤،ص٩٦.
٣٧- كارنيه ، المصدر السابق،ص٦٥.
٣٨ - حسن الخياط ، جغرافية اهوارومستنقعات جنوبي العراق، معهدالبحوث و الدراسات العربية، القاهرة،١٩٧٥،ص١٧٤.

٣٩-Coatman J." Migration in the ٢٠th century", population jour Vol .I.
Pp.٥٧-٧١

٤٠-A.E.Smailes; p.٥٩

٤١ - وزارة التخطيط،هيئة التخطيط الاقليمي، التقرير الاولى لتخطيط اعالى الفرات ، بغداد، ١٩٧٥، ص٢٤٩-٢٥١.

٤٢- عبدالفتاح محمد وهيبة، المصدر السابق،ص٢٦.و شاكر مصطفى سليم، الجبايش،دراسة انثروبولوجية لقرية في اهوار العراق، مطبعة الرابطة، بغداد،١٩٥٦،ص٣٥٦.

٤٣- محمد حجازى ، المصدر السابق،ص٢٠٣.

٤٤- عبد الرزاق البطيحى وعادل عبدالله خطاب ، المصدر السابق،ص٩٠-٩١.

٤٥- المصدر نفسه، ص ٩٠.

٤٦-Huntington, E. Civilization and climate, London, ١٩١٥, p.٣٢.

٤٧- كارنيه، المصدر السابق،ص٨٧-٨٨.

٤٨- محمد عبدالرحمن الشرنوبي، المصدر السابق،ص٢٣٣.

# بەشی چوارەم

# دێ نشینی پلاندانراو

**پێناسەوبایەخدانی:**

پلاندانان بر یتیە لە شێوازێکی زانستی کە ئامانجی لێکۆلینەوەیە لە هەموو تواناکان ودەرامەتەبەردەستەکان لەوولاتێکی دیاری کراو یان ناوچەی دیاری کراو ، هەروەها دیاری کردنی چۆنیەتی بەکارهێنانی ئەم دەرامەتانە بۆ وەدەست هێنانی امانجەکان و چاکتر کردنی بارودۆخ .[1] لەبەرئەوەی بەکارهێنانی باشترین رێگاووشێوازلە بەگەرخستنی زەوی و پێشبردنی پەیوەندییە شوێنیەکان لە گرنگترین ئامانجەکانی پلاندانانە ، بۆیە پلان دانەران دەبێ بایەخ بەسەنتەرەکانی ئاوە دانی مرۆیی بدەن ، وەکو شێوەیەکی بەکارهێنانی زەوی مەبەستمان لە دێ نشینی پلاندانراو ئەو نشینگەیە یان کۆمەلگا جێنشینەکانی ناوچەی لادێی کەپلانی بۆ دانراوە لە رێگەی لێکۆلینەوەی تایبەت بەم مەبەستە ، ئەمەش واتای ئەوەیە کەئەو جۆرە نشینگانە بە شێوەیەکی لی خۆرا پەیدا نەبووەنە یا بەرەو پێش نەچوونە هەروەها ئەو کۆمەلگا جێنشینانەش دەگرێتەوە کە بەهەرەمەکی پەیدا بوونە بەلام دواتر گۆرانکاری بەسەر هێنراوە بۆتە شوێنێکی پێشکەوتووتر و زیاتر پێداویستی یەکانی دانیشتوانی بەدەست دەکرد .

لەسەر ئەم بنچینەیە بایەخدانی پلان دانەر لەوەوە هەلدەقولێ کە هەلسەنگاندنێکی راستیگەری پەیوەندی نێوان دەرامەتی بەردەست و مرۆڤ و هەبوونی لەشوێنی جێگیر بوون و نیشتەجێ بوونی بکات ، هەروەکو چۆنیش جوگرافیا بایەخ بە شوێنی نیشتەجێ و سەنتەرەکانی دەدات و دەچێتە قوولایی ووردەکاری جۆری نشینگەو پێکهاتەی پیشەیی هەروەها بایەخیش بە پەیوەندی نێوان لەگەل رووبەری دەوروبەری دەدات و کاریگەری هاوبەشی هەریەکەیان لەوی تر[2]زانراویشە کە دێ نشینی پلاندانراو تەنها بە پلاندانانی نشینگە یا خانووی سنووردار نابێت بەلکو ئەو هەرێمەی کەنشینگە کانی لادێی تیادایە لە

خۆدەگرێت بە تایبەتی لەدوای کراوەیی دێهاتەکان بەسەر سەنتەرەی شارەکاندا بەهۆی ئەو پێشکوتنەی لە شێوازەکانی و ئامرازەکانی هاتووچۆکردن روویدا .
دیٚ نشینی پلانداراو لەگەل بایەخ دان بە بنیاتنان و پێشخستنی گوندەکان و کۆمەلگا جێنشینەکان ناکریٚ بەهەر شێوەیەك بێت جیای بکەینەوە لە بابەتی بووژانەوەی دێهات بەتایبەتی دانیشتوانی دێهاتی و گوند هێشتا کەرتێکی سەرەکی لە کۆی دانیشتوانی جیهان پێك دێنن وهەروەها ناکریٚ بابەتی دیٚ نشینی بە جیا لەلایەنی تری پەیوەندار بە بوژانەوەی دێهاتی.[٣]

لە کاتی ئێستادا واپێدەچیٚ کە هەندیٚ بەرەنگاربوونەوە تووشی کۆمەلگای دێهاتی بوەتەوەو بەردەوام لە زیاد بووندایە لەگەل رۆژگار لە دوای ئەوەی جۆری ژیانی بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ بەبیٚ رێك خستن و دیاری کردنی وورد بەرێوە دەچوو، ئەم بەرەنگاربوونەوانەش بابەتێك نیە بە تەنها پەیوەندی بە دیاریدە سەرپێی یان گۆرانکاریەك بێت کە هەندێك لایەنی یا دیاریدەی ژیانی لە خۆ گرت بێت بەلکو بابەتێك پەیوەندارە بە چارەنووسەوە کە مەترسی ئەوەیە لادێی وەکو دیاریدەیەکی جیاکەرەوەی ژیان بەرەو نەمان و لەناوچوون بروات.[٤] پێویستە لێرەدا بووترێت کە گۆرانی تێگەیشتنی خێزانی لە سیستەمی یەکگرتووی گەورە (خێزانی درێژەوەبو(عائلە ممتدە )) بۆسیستەمی خێزانی بچووك و سەرەرایی جوجۆلی بەردەوامی شوانکارو بە دووەکان وای کردووە بابەتی جێنشینی گرنگی یەکجار مەترسیدار بێت بەتایبەتی گەربزانین رێژەیەکی باش لە خانووەکانی بەکارهاتوو ناشیٚ بۆ نیشتە جێیی بوون کەئەمەش وادەکات گرفتەکە رەهەندی زەحمەت تر وەرگریٚ لە پرۆسەی بەرەو رووبوونەوەو بەرەنگار بوونەوەی ، لێرەدا گرنگی پلاندانالن بەدیار دەکەویٚ لە بنیات نانی گوندو کۆمەلگا جێنشینەکان و هەولدان بۆ بووژانەوەو بەرەو پێش بردنی بە شێوەیەك کە بگونجیٚ لەگەلٚ چالاکی مرۆیی (( ئابووری و کۆمەلایەتی )) لە ناوچەکانی دێهاتی دواتر نشینگەکان دەبنە جێگری گوندی بچووك و خانووی بلاوەو دەبێتە مایەیی رزگار کردنی لادێی لە دوورە پەرێزی و

تـەنهایی هـەروەها دەبێتـە بنـچینەیەکی سـەرەکی لــە دووبـارە بنیاتنانــەوەی نـشینگە دێهاتیەکان.[٥]

گوند بەتەنها نابێتە نیشتەجێ بوونێکی سەربەخۆیی یەك لایەنە ، بەڵکو نشینگە دێهاتیەکان بەشێکن لەسیستەمێکی نیشتەجێ بوونی ئاڵۆز کەبەدەیەها گوندی قەبارە جیاواز لە خۆدەگرێ و هەمووشیان لە تۆزێك یا چەندین تۆری پەیوەست بە پەیوەندییەکی شوێنی تەواوکەردا رێك دەخرێت ،کەشارەکان سەنتەریان پێك دەهێنێ .[٦] تێگەیشتنی نیشتەجێبوون و دێ نشینی لەو ماوەی دوایيدا بەرەو پێش چووپەرێەوە بەسەر رەگەزی تەسکی خانوو بۆئەوەی لە تێگەیشتنێکی گشتگیرتردا دابرێژیتەوەو بۆبەدەستهێنانی هەموو خزمەتگوزاریە پێویستیەکانی شوێنی رابواردن و حەوانەوە کە ئەمانەپێویستە هەبێت تاکو مرۆڤ ژیانێکی سەرفراز بژیت و هاندەرێك بێت بۆئەوەی بەرهەم و توانای زیاتر بێت بۆ بەرەو پێشبردنی پرۆسەی بوژاندەوەو بەرەو پێشچوون .[٧]

دووبارە دابەشکردنی نشینگە دێهاتیەکان و هەڵبژاردنی پێگەکانیان پێویستی دووبارە بە دۆزینەوەی سیستەمێکی تەواوکەر هەیە کەوا بکات پرۆژەی بەیەکەوە بەستراو پەیدا ببێت بۆخزمەت گوزاری تەندروستی و دەزگاکانی فێرکردن و سەنتەرەکانی خزمـەتگوزاری و کۆمەلایەتی . چونکە ئەم جۆرە پرۆژانە سەرکەوتوونابێت بەبێ دەست تێوەردانی دەوڵـەت و هاریکاری بە پێ ی پـلان و پرۆگرامـی دارێـژراوو وەرگـیراو لەلێکۆڵینـەوەی ووردو توانای گونجاو ، پرۆسەی بنیاتنانی کۆمەڵگا نشینەکان بێ گومان کارێکی ئاسان نی یـە . چونکە بنیاتنانێکی شارستانی تەواوکەرەو پەیوەستە بە تێکرایی ژیـانی دێهـاتی و هـەروەها بنیاتنانی خانوولە گوندێك کارێکی هونەری سەربەخۆ نیـە بەقەدەرئـەوەی ئامرازێکـە بـۆ هەڵسوو کەوت لەگەڵ گرفتێـك کـە دەبێـت تیایـدا بـارودۆخی پێگـەی کۆمەلایـەتی و ئابووری دەروونی جووتیار بەهەند وەربگیرێ هەروەها راستی مێـژووی و شارسـتانی کـە تیایدا ژیـاوە بۆماوەیـەکی دوورو درێـژو راهـاتووە لەسـەری ،[٨] جگـە لـە بـارودۆخی تەندروستی و رۆشنبیری و رامیاری و بارودۆخی ژینگەی سروشتی.

پرۆسەی نیشتەجێ بوون دەبێت لە ڕێگەی تێگەیشتنی هەموو فاکتەرەکانی سروشتی و مرۆیی پەیوەندار بێتە کایەوە و لەڕێگەی هەڵسەنگاندنی هەموو رێکخراوەکانی کاریگەر بەسەرهەڵبژاردنی پێگەی گونجاو . شتیکی ئاساییە پێگەی خانوویك کەگونجاندن و رێکخستنی ژینی لەگەڵ راستی ژینگەی دەوروبەری تێدا نەبێت ،نەشاز دەبێت وئەمەش دەبێتە مایەی لەدەست دانی بەهای شوێنی نیشتەجێبوون.[٩] بۆیە پێوستە لێکۆلینەوەی ووردو گشتگیر بکرێت لە پێش پرۆسەی بنیاتنانی گوندو کۆمەلگا جێنشینەکان کە دەست پێ بکات لەبەدیارخستنی جۆری دابەش بوونی جوگرافی ڕاستەقینی لەناوچە دێهاتیەکان و دواتر ڕووپێوی دانیشتوانی و خزمەتگوزاری و ڕێگاو بان فاکتەری تری پەیوەندار بەجۆرو پلاندانانی گوندوکۆمەلگا جێنشینەکان ،هەروەها لێکۆلینەوەی پێکهاتەی پیشەیی ئەم کۆمەلگایانە بکات وڕادەی پەیوەندی بەسەنتەرە شاریەکان و کۆتایی بێت بە دیاریکردنی گرفت و ئاستەنگەکان بەدەرئەنجامی تیۆری و چارەسەری پراکتیکی بۆدابەشکردنی ئەم کۆمەلگایانە بەمەبەستی گەیشتن بە نیشتەجێبوونێکی دێهاتی پێشکەوتوو.

جۆرەکانی دێ نشینی پلاندانراو:

دەکرێ دووجۆر لەنیشتەجێ بوونی دێهاتی پلاندانراو تێبینی بکەین :

١ – گوندی نموونەیی، کەلەلایەن دەزگاو فەرمانگەی ڕەسمی و نیمچە ڕەسمی و کۆمپانیاو دەزگا تایبەتیەکاندا دەکرێ.ئەم گوندانەش بەوە جیا دەکرێنەوە کە پلانی پێشەکی بۆ خانووەکان دانراوە کەلە شێوەی چوارگۆشە یا بازنە یا لاکێشە بێت بە پێی دێزاین و نەخشەی تایبەتی کەئەم لایەنانە ئامادەی دەکات زۆرجاریش خانووەکان لێکچوو دەبن لێرە دا لەڕووی قەبارەی خانوو ڕووبەری یەکسان و شەقامی فراوان و ڕێکی

٢ – زەوی دابەشکراوو بەسەر جووتیاران ،کە دواتر خۆیان ئەرکی بیناکردنی دەگرنە ئەستۆ بەپێ ی نەخشەی دیاری کراو کەبەسەریان دابەش دەکرێ و پابەند دەبن بە جێبەجێ کردنی.

جێی خۆیەتی ئاماژە بەوە بکرێ کەلە ئەلمانیا دووسیستەم بۆنشینگە دێهاتیەکان هەیە ، یەکەمیان دێرین (تقلیدی) ، ئەوی تریان پشت بە سیستەمی کۆمەلگای کشتوکالی پلاندانراوی نوێی بیناکردن دەبەستی. سەنتەرەکانی پلاندانراو لەو هەرێمانە هەیە کەلە سەدەکانی ناوەراست ئاوەدان و فراوان کراون . لە بەریتانیاش گوندی بەناو (( القری الولیدە )) پەیدا بوو. [١٠] کە گوندی تازەیەو فراوانی رووبەری کشتوکالی و زیاتر برینی داری دارستانەکان و تەرخان کردنی زەوییەکەی بۆ کشتوکال کردن یارمەتی بلاو بوونی دا .

لەویلایەتە یەکگرتووەکانیش نیشتەجێ بوون و ئاوەدان کردنەوە بە سیستەمی دێهاتی پلاندانراو دەستی پێکرد .ئەم شێوەیەش لە پلانی نیشتەجێ بوون و زەوی کشتوکالی تەرزی بلاوەبووی سەپاندە سەرپێکهاتەو شێوەی دێ لە جیهانی نوێ ، بەلام لەگەل ئەوەشدافاکتەرەکانی ژینگەی سروشتی رەنگدانەوەی خۆی هەبوو لەسەر پلانی خانووەکان و هەندێك جاریش ئەندازەی گوندەکەی تێکداوە .

ئەو نیشتەجێبوونەی کەناوچەکانی رۆژئاوای ولایەتە یەکگرتووەکان ناسیویەتی نموونەیەکی نیشتەجێبوونی پلاندانراوە پشت بەست بە نەخشەی ئەندازەیی کە شێوەی چوارگۆشە یا بازنەیی وەرگرتووە ،وەکو بنچینەییکی پرۆسەی نیشتەجێ بوون ، هەروەکو دەکرێ ئەو شێوەیە لەنەخشەسازی تێبینی بکرێ لە ئینگەلتەرا لە سەدەکانی حەڤدەو هەژدەدا. پلاندانەرکانیش سەرکەوتووبوونلە دانانی سیستەمێکی دارێژراو بۆ دابەش بوونی و دیارێکردنی دووری نێوانیان .

هەروەها گوندی پلاندانراو لەهەریەك لە ئوسکوتلەنداوو ئێرلەندا پەیدا بوو، کە زۆرجار رێرەوی دێهاتی ئینگلتەرای دەگرتە خۆ لە رووی ئەندازەو رێکخستن. لە

ئوسکوتلەندا گرووپێ گەورە لە گوند دروستکرن لەنزیك ناوچە پیشەسازیەکان و سەنتەرە شاریەکان بۆ هەلمژینی ژمارەی زیادبووی دانیشتوان . لە ئێرلەنداش گوندەکان بوونە شاری بازار(مدن الاسواق ) وبەوە جیا دەکرایەوە کە پانتایکی تێدا بوو بە بازار دەناسراو ڕووبەری لەگەلّ قەبارەی گوندەکە گونجاو بوو، هەروەها شەقامێکی سەرەکی تێدا بوو لە پالّ شێوەی چوارگۆشەو شێوەی بازنە و هەشتی گرتبووە خۆ .[١١]

یابانیش قۆناغێکی لە فراوانبوونی پلاندانراوی نیشتەجێبوونی بە خۆوە بینی وپرۆسەی فراوانبوونیشی لەگەلّ ئەو گۆڕانکاریانە هاتە دی لەهەردووئابوری کشتوکالّی و پیشەسازی کە پشتی بە شێوازی بنیاتنانی گوندی تەواو کەر دەبەست کەخانووی ئامادەکراو بە هەموو خزمەتگوزاری و پێویستیە ڕۆژانەکاندا لە خۆودەگرێت .

لەمیسریش نیشتەجێبوونی پلاندانراو بەم شێوەیە بوو کە هەر خێزانێك پارچەیەك زەوی پێ دەدراو لەڕێگەی سێ جۆرە شێوەی خانووی دیاریکرا وو سەربەست بوو لە هەلّبژارد یەکێکی ،[١٢] کە ئەمانەن:

ا — چەندخانوویکی دێهاتی کە کۆمەلێك نیشتەجێبووی لە خۆدەگرێ .

ب —خانوویکی دابەشکراوو بە شێوەیەك هەر خانوویەك بکەویتە سەرهەمان زەوی کشتوکالّی خێزانەکە .

ج — خانووی دێهاتی لەشێوەی هێلێکی درێژوەبووبە هاوتەریپی ڕێچکەی ئاوودێری .

لە سوودانیش ، ئامادەباشی گواستنەوەی دانیشتوانی ئەو ناوچانەی کە دەچووە ژێر ئاوی بەنداوەوە لە ئارادابوو لە کاتێك کە ئامادەبوون نەخشەی ناوچە جێنشینە تازەکەیان جێبەجێ بکەن . بۆ زانینیش ئەم وولاتە توانستی گەورەی دەوێ لە بواری پلاندانانی دێهاتی ، چونکە ڕێژەی دانیشتوانی دێهاتی لە سالی ( ١٩٨٦ ) دا ٨٥ ٪ ی تێکڕای دانیشتوانیبوو، لە کاتێکدا دێهاتی سوودانی بەرەو رووی گرفتی دواکەوتووی و کەمی سەرمایەی تەرخانکراو بۆ پێشخستنی کەرتی کشتوکالّی و دێ نشینی بووەتەوە.

جێگای ئاماژەیە ئەو هەرێمانەی کە پلانی بووژاندەوەی لە خۆگرت لە ڕێگەی ئەو بەگەرخستنانەی کە بەردەستی بوو لە بەکارهێنانی دەرامەتی سروشتی وەکو کانزاکان، ئەوەی سەپاند کە پێویستی بوونی بنیاتنانی نشینگەی جێنشینی تازەو نەخشە کێشراو بێتە ئاراوە لە رووی شێوەی گشتی یا لەرێگەی بیناکردنی خانووەکان و ڕێکخستنی تۆرەکانی گواستنەوە، زۆرجاریش لێرەدا نەخشەی چوار گۆشە پەیڕەو دەکرێ هەروەکو هەرێمی بەنجابی هیندی و هەروەها لەمیسر لە دوای پلانی گەرانەوەی دانیشتوانی دێهاتی لە پرۆژەی بەنداوی بەرز ( السد العالي ) هەروەها لە بەنداوی قادسیەی عێراقدا .

لە هەرێمە ئاوەدانکراوەکانی جیهانی نوێ و ئوسترالیا و نیوزلەندا ، سەبارەت بەو کۆچبەرانەی کە هاتن بۆی، وارەچاو کرا کە رێك بخرێن لە پرۆسەیێکی دابەشبوون بەسەرسەنتەرەکانی نیشتەجێ بوون ودابەشکردنی مولکداریەتی زەوی کشتوکالی و لەوەڕگاکانداو پابەند بوونیان بەرێنماییە بیناکاریە دیاریکراوەکانی تایبەت بە خانوو یا نەخشەی گوندەکە . لە هەندێك هەرێمدا نیشتەجێبووەکان بە شێوەیەکی سەربەخۆ پەنایان بردە بەر نیشتە جێی رێکخراو بەبێ پابەند بوون بە یاساوو رێنمایەکانی لایەنە فەرمیەکان، ئەمەش دەکرێ پێی بووترێت نیشتەجێی سەربەخۆی پلاندانراو .

لە هەرشوێنێکیش سیستەمی کشتوکالی بە کۆمەڵ کە جۆری کۆکراوەی نیشتەجێبوونی تێداباو بوو ، چالاکی ئابووری ئاراستە کراوو چالاك دەبێ و دەولەت بە پێی پلانی دیاریکراو کاردەکات بۆ بنیاتنانی سەنتەرەکانی نیشتەجێبوون هەروەکو لە سەیبریای یەکێتی سۆڤیەت هەبوو . لەلایەکی ترەوە ئاراستە کردنێکی تر کاردەکات لەپاڵ پلاندانانی گوندو کۆمەلگا جێنشینەدێهاتیەکاندا ،ئەویش جەختکردنە سەر گوندی دیاریکراوە بۆ بووژاندەوەو پێشخستنی . ئینگلیزەکان هەولی لیکۆلینەوەی ئەو لایەنەیان دابە شێوەیێکی واقیعی وچەند پێوەریکیان دارشت کەلە ژێر رۆشنایی بریاری مانەوەی هەندێ گوندی دیاریکراو بدرێ و ناوی گوندی کلیل ( القرى المفاتيح )یان لێنا ،(١٣) کەبریتیە لە چەند گوندێکی سەرەکی و لەکاتی بووژاندەوەو پێشخستنی بایەخ دەدرێتە

- بوونی بە شێوەیێکی ئابووری و بووژاندەوەی زۆرچاك هەروەها لە پێگەی ناوەنجی ێ سەبارەت بە گوندەکانی تر .

هۆلەندیەکانیش هەولّی دیاریکردنی گوندی کلیلیان دا لەوولاتیان بەبەکارهێنانی چەند پێوەرێکی لێکچووی ئەوەی ئینگلیزەکان بەکاریان هێنا بەلاّم رێککەوتنێکی یەکلا نەبوو سەبارەت بەقەبارەی نموونەیی ئەم گوندانە. چونکە ئەو رێژەیەیی کەتایبەتە بەهەرێمێکی دیاریکراو مەرج نیە پراکتیك بکرێت لە هە رێمی تردا و زۆر جاریش هەیە کە کۆبوونەوە مرۆیە کان ناچێتە ژێر هۆکارێکی ئاشکراو لەوانەشە ئەو هۆیانە ئاشکرانەبێت کەبۆتە مایەی پەیدا بوونی بەتایبەت کۆمەلگا دێهاتیە قەبارە بچووکەکان.

بۆمەبەست دانانی پلانی گونجاو پسپۆرەکان بەتایبەتی لەئەورووپای رۆژئاواو یەکێتی سۆڤییەت، پێویستی پابەندبوون بە چەند پێوەرێك دەخەنە روو،لەوانە:

ا / دان پێنانێکی فەرمی دیاریکراو کەبەپێی ئەو پلەکانی نشینگە سەرەکێەکان یا سەنتەرەکان دیاری دەکرێت .

ب / دیاریکردنی پێگەی هەرنشینگەیەك سەبارەت بە ئاستی گونجاوی لەنێوان ڕێزبەندی نشینگەکانی تر .

ج / دابین کردنی هەرنشینگەیەك بە خزمەتگوزاری و پێویستیە شارستانیەکان بە پێی رێزبەندی لە نێوان نشینگەکاندا .

لە یەکێتی سۆڤیتیش کار لەسەر ئەمانی خوارەوە کرا[١٤] :

١ – فراوان کردنی سەنتەرەدێهاتیە قەبارە گەورەکان ،لە رێگەی کار کردن لە سەر بەردەستکردنی خزمەتگوزاری هەمەجۆرتیایدا هەروەها دامەزراندنی پیشەسازی دێهاتی وچالاکردنی جگە لە چالاکیە شارستانیەکانی ترو کار کردن لە هەمان کاتدا بۆ نەهێشتنی گوندی قەبارە بچووك .

٢ – چاکتر کردنی ئەندازەو نەخشەی نشینگە دێهاتیەکان و دابین کردنی ئاسانکاری هاوشێوەی ئەوەی هەیە لەسەنتەرە شاریەکان و بە لایەنی کەمەوە پێویستیە سەرەکیەکانی.

بۆدیاریکردنی ڕێزبەندی گوندەکان لە گوندی گەورە بۆ سەنتەرەکانی کێڵگەی دەولەت بۆ کێڵگە بە کۆمەڵەکان بایەخ درایە قەبارەی دانیشتوان . ئەم گوندانەش لە خشتەیەك دانران کە لەسەر بنچینەی ( ١٠٠٠ ) کەس وەکو ئاستی کەمی ئەم جۆرە دابەشبوونە پەیرەو کرا هەرناوچەیەکیش نەخشەی تایبەتی خۆی هەبوو بە پێی چڕی دانیشتوان و سروشتی زەوی و چالاکیە ئابووریەکانی .

لەوەی پێشوو بۆمان دەردەکەوێت، پێویستی بایەخدان بە بەرەو پێشبردنی نشینگە دێهاتیەکان بە شێوەیەك کە گرنتی تەواوی بەدەست هێنانی خزمەت گوزاری پێویستی بۆ دانیشتوان بێتە بەردەست. ئەمەش وادەکات پێویست بێت گوندەکان لەسەر بنچینەییکی هەرەمەکی ببەسترێتەوەو گوندی بچووکی تێدا بێت ،کەلایەنی کەمی دانیشتوان و خزمەتگوزاری تێدا بێت هەروەها گوندی قەبارە گەورەو مام ناوەند کە ژمارەییکی دیاریکراوی گوند و کۆمەلگا بچووکەکان خزمەت دەکات . هەندێکی تریش سەنتەری بێت و ژمارەییکی زیاتر گوندو کۆمەلگای بچووکتر لە خۆی خزمەت بکات و خزمەتگوزاری پێشکەوتووترو بەتواناتری تێدابێت ، بڕوانە شێوەیژمارە ( ٣ ).




شێوەی ژمارە ( ٣ ) پلاندانانی گوندی سەنتەری

دابەشبوونی جوگرافی ئەم گوندانە لە ڕیزبەندە جیاکانی کاریکی تایبەتە بە لێکۆلینەوەی وورد، کە ئامانجی باشتر بەکارهێنانی زەوی و بەفیڕۆنەدانی یان بەلاوەنانی دەرامەتی سروشتی و بەهەند وەرگرتنی بارودۆخی کۆمەلایەتی و ئابووری دانیشتوانی.

ئاشکرایە گوند ، بریتیە لە کۆمەلێك خانووی دراوسێ کە جووتیارەکان تیایدا نیشتەجێنوو ، بژێویان پشت بە چاندنی زەوی دەوروبەری گوندەکە دەبەستن لە پاڵ بە خێو کردنی ئاژەڵ. لە گوندیش لە وولاتانی تازە پێگەیشتوو ئاژەڵەکانیان دەرئەچن کە جووتیارەکان پشتی پێ دەبەستن بۆ کاری کشتوکاڵی وهەروەها ئامێری کشتوکالی و پەینی کیمیاوی لێ ی دەرئەچێ بەرەو کێلگەو دواتر دەگەڕێتەوە گوند بە کۆتاهاتنی کارەکانیان . بەروبوومی کشتوکاڵیش دەچێتەوە گوندولەدواییدا بەرهەمی کشتوکاڵی و ئاژەڵی کۆدەبێتەوەو دواتر دەگوازرێتەوە بۆ بازارەکان وئەمانە وادەکات گوندەکان بازنەی بەیەك بەستنەوەبن لە زنجیرەی فرۆشتنی بەروبوومی کشتوکاڵی.لەگەل ئەوەی ئەمە نابێتە ئاستەنگ لەبەردەم گواستنەوە بەرووبومەکان لەکێڵگەکانەوە بۆ بازارەکان یا کارگەکان راستەوخۆ بەبێ ئەوەی لەگوند تێپەربێت .

لەوانەیە دیاریکردنی باشترین پێگە بۆ گوندەکان و دیاریکردنی پەیوەندی بەزەویە کشتوکاڵیەکان کەدانیشتوان پشتی پێی دەبەستن لەو کارە گرنگانەبێت کە جوگرافیزان بایەخی پێ دەدات. دووری گوند لە سەرچاوەکانی ئاوو ژیان زەحمەتتر دەکات هەروەها دووری لە ڕێگاو بانەکان وادەکات ئاستەنگ دروست بێت لە بەردەم سەرفکردنی بەرووبومەکان و بەردەست بوونی خزمەتگوزاری وکالا هەروەها دووری لە سەنتەرەکارگێریەکان، دانیشتوانی ماندوودەکات، بۆ یەش هەڵبژاردنی پێگە لە کارە گرنگەکانی بەرەو پێشبردنی گوندە بۆ زیاتر بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی و ئاژەڵداری و بەرزکردنەوەی ئاستی بژێوی دانیشتوانی. (١٥)

گومان نیە کەهەر چەندە دووری نێوان گوند و زەوی کشتوکاڵی زیاتر بێت ،بە تایبەتی لە قۆناغێکی دیاریکراوی پێشکەوتنی ، دەبێتە مایەی بە فیڕۆدانی توانستی مرۆیی

، چونکە گەر دووریەکە ڕادە بەدەربوو ئەستەمە جوتیار بتوانێت بە پابیریت . ئەمەش وادەکات هۆیەکانی گواستنەوە بەکاربهێنێ ، لەوانەشە جووتیار پێی دابین نەکرێت.

لەگەڵ ئەوەی دووریکی دیاریکراو نیە تایبەت بە مەودای نێوان گوند و کێڵگە کشتوکاڵیەکە بەلاّم هەندێك وولاّت چەند خەملاندنێکیان وەرگرت بۆ گونجاوترین دووری لە ژێر رۆشنایی قەبارەی گوندو رادەی فراوانی زەوی کشتوکاڵی و ئاسانی گواستنەوە .

لەم وولاتانەش[١٦] :

| | |
|---|---|
| بەلجیکاو سویسرا و هۆلەندا | ٠,٣ – ١ کم |
| ئەلمانیا و فەرەنسا | ٠,٣ – ٢ کم |
| رۆمانیا | ٠,٥ – ٠,٧ کم |
| ئیسپانیا | ٠,٣ – ٦ کم |
| بولغاریا | ٢کم وەکو پێوەر |
| چین | ٠,٦ وەکو پێوەر |
| هەرێمی برنج لە چین | ٠,٣ – ١ کم |

زۆرگرنگە رەچاوی نزیکی گوند لە سەرچاوەکانی ئاووی پێویست بۆژیانی رۆژانەو بەرهەمهێنان بەهەند وەرگیرێ، هەروەها نزیکی لە رێگاکانی گواستنەوەو بەستنەوەی بە نشینگەکانی تر لە پاڵ بایەخدان بەپێگەی گوند لە رووی سروشتی ئەو زەویەی کە گوندەکەی لەسەرەو، گرنگی بەرگریکردن تیایدا گەرپێویست بوو .

پیشە کاریگەریکی سەرەکی هەیە بەسەر پلاندانانی نشینگە دێهاتیەکان و دیزاینکردنی خانووەکانی چوونکە گوندێك کە خەلکەکەی خەریکی کشتوکاڵ بن جیاوازە لەگەڵ ئەو گوندەی شوانکاری دەکەن. هەروەها نەخشەکە دەگۆڕێ گەر دانیشتوانی خانووەکان کشتوکاڵ و ئاژەڵ داری بکەن ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی پێویستی جێنشینی و

فاکتەری دووری وشێوەی دابەش بوونی ژوورەکانی و خزمەتگوزاری و پێویستیە ژینگەییکانی تر دەبێت ڕەنگدانەوەی ئەو پێویستیانە بێت. هەروەها گرنگە گونجاندن و ئاشنا بوون لە نێوان ژینگەی سروشتی و ژینگەی کۆمەلایەتی دانیشتوانی چالاکتر بکرێت ، چونکە بەهای کۆمەلگاو دەرامەتی خۆماڵی کەرەستەی سەرەکین و دەبێ سوودیان لێ وەر گیرێ لە پرۆسەکانی پلاندانان و بووژاندەوەی نشینگە دێهاتیەکان . (١٧)

ئاشکراشە کە خانووی دێهاتی تەنها شێوەیکی داڵدە (ماۆی) نیە،بەڵکو لە هەمان کاتدا چەندین پیشەی ئابووری و کۆمەلایەتی پێشکەش دەکات کەڕەنگدانەوەی قۆناغی رۆشنبیری وکۆمەلایەتی دانیشتوانیەتی،بۆیەش گەرنەخشە سازی خانوو دەربڕینێکی ئەم پێویستیانە نەبێت ئەواسەرکەتوونابێت وەکو ئامرازێکی گۆران وبەرەو پێشچوونی کۆمەلایەتی .(١٨)

**قۆناغەکانی پلاندانانی دێ نشینی نوێ :**

جوولاندنی کۆمەلگایەك لە بنچینەیکی ئابووریو کۆمەلایەتی و رۆشنبیری ، کە چەندین ساڵ جێگیر بووە لەسەری بۆ شێوازێکی پێشکەوتووتر توانای گەورەی پێویستە ، لەوانەش زاڵبوون بەسەر کاریگەری دەروونی کەلە دەرئەنجامی ئەم جوولانەوەیەوە دێتە ئاراوە ەبەتایبەتی لە کۆمەلگا دێهاتیە ستەکان (المجتمعات الريفيه الرتيبه) .

ئاساییە، جیاوازی لەو گۆرانکارە سروشتی و مرۆییانە ی لە نشینگە دێهاتیەکاندا هەیە وامان لێ دەکات جەخت لەسەر ئەوە بکەینەوە کە شێوازی جێگیر بۆ پێوەرەکانی تایبەت بە هەموو هەرێمەکان دا نەنین، کە ئایا تایبەت بێت بە نشینگە دێهاتیەکان یا خانووەکان ،ئەمەش وادەکات شێوازێکی نەرم (مرن) دابنرێت کە بتوانێ رادەییکی دیاریکراوی پێداویستیەکان بەردەست بکات، بەمەرجێ ووردەکاری بەجێ بهێلدرێت بۆ لێکۆلینەوەی گۆرەپانی و ئەکادیمی کەلە ژێر رۆشنایی پێوەری تایبەتی بۆدائەنرێت .(١٩)

هەروەها پلانی جێنشینی، لە ڕێگەی ئاراستە کردنی بۆ لەخۆگرتنی بەرەو پێشچوونی دیاردەی جێنشینی ، دەبێ راستی ئابووری وولات و پلەی گەشە کردن رەچاووبکات

لەسەر ئەم بنەمایەش نابێ پێوەرە جێنشینەکانیش جێگیر بێت بەڵکو دەبێت بگونجێت لەگەڵ ئەو پێشکەووتنە کۆمەلایەتیە و ئابووریانەی کە هەیە، لەم ڕوانگەیەوە دووبارە دەبێ چاوو بە پێوەرە جێنشینەکان بخشێتەوەو بە شێوەیکی خولاندنەوە(بشکل دوری) کە بگونجێ لەگەڵ قۆناغەکانی پلانی کۆمەلایەتی و ئابووری ئەم وولاتە هەروەها تێکەل بێت لەگەڵ پێویستی و ئاواتەکانی جێنشینی لەلایەك، لەگەڵ دەرامەتی بەردەست لەلایەکی ترەوە .[20]بۆیەش لەکاتی دانانی پرۆژەکانی پلانی جێنشینی لادێی گرنگە نەرمی هەبێت لە پرۆسەکانی پلاندانان و ئامادەکردنی نەخشە سازیەکان، بە شێوەیەك کەبگونجێ لەگەڵ ئەوجیاوازیانەی لە نێوان کۆمەڵگا پەیوەندارەکان هەیە ، بەپێی قۆناغی شارستانی گەیشتوو جۆری گۆرانکاری دیمۆگرافی و چالاکی ئابووری پەیرەو کراو.

شتێکی سروشتیە کە دابەشبوونی بلاووەی نشینگە دێهاتیەکان و خانووەکانی دەبێتە مایەی ئەستەمی پێشکەش کردنی پێداویستیە خزمەتگوزاریەکان لەلایەك ، هەروەها وادەکات ژمارەیکی زۆری جووتیاران دابڕێن لەو پێشکەووتن و گۆرانکاریە ئابووری و کۆمەلایتیەی وولات. هەروەها پەرتووبلاوی گوندەکان و دابەشبوونیان بەسەر رووبەری فراوان دەبێتە مایەی ئەستەمی بەردەست کردنی رێگاکانی هاتووچۆی چاك و ئاسان . ئەمەش جووتیار زەرەرمەند دەکات و داهاتیان کەمتر دەکات و دەبێتە مایەی زەحمەتی پەیوەندیکردنیان بە سەنتەرە شاریەکان، ئەم حالەتەش پالپشتی بوونی چارەسەری ئەم دیاردانە دەخاتە روو خێرایی دانانی چارەسەری سەرکەتوو بۆی لە پاڵ ئەمەش، مانەوەی جووتیاران لە گوندی دابڕاوو خانووی لێك دوور دیاریدەییکی کۆمەلایەتی دواکەوتووە و پەیرەو کردنی پرۆگرامی چارەسەری و بوژاندەوەی لەگەڵ سەرکەتوونابێت.[21] بۆیەش پەنا بردنەبەربنیاتنانی گوندی هاوچەرخی نوێ کە دابین کراوە بەهەموو خزمەتگوزاریە کۆمەلایەتیەکان و سەنتەرەکانی سەرف کردن ( التسویق ) بەپێی نوێترین نەخشەسازی و بەستنەوەی بەشارەکاندا لە رێگەی هێلی گواستنەوەی خێراو هۆکاری گواستنەوەی چاك کە گەیاندنی بەرهەمە کشتوکاڵیەکان بۆ سەنتەرەکانی بەکاربردنی ئاسانتردەکات

لەلایەکی ترەوە گوندی پەرتووبلاو وکۆمەلگای بچووك دیاریدەییکی ناپەسەندە زۆربـەی کاتدا، وەکو ڕەزو باغی دابراو(بساتین منعزلـه) یا ناوچـە شـاخاویەکان یـا مولکداریـەتی تایبەت یاناوچەی زەلکاویا واحاتی بیابان، کەلە زۆربەی کاتەکاندا سوودلـە سـەنتەرەکانی خزمەتگوزاری نزیکی وەردەگری.[٢٢]

دووبـارە ڕێکخـستنەوەی نـشینگە دێهاتیـەکان دەبێتـە مایـەی بـەرەو پێـشبردن و بووژاندەوەی ئەو نشینگانەی کە بریاری مانەوەی دەدرێ بۆ خزمەت کردنی دانیـشتوانی دێهاتی، ئامانجی ئەوەیە کە :

١ – بەکارهێنانێکی چاکتری ژێر خانە ئابووریەکان .

٢ – دابەش کردنی نشینگە دێهاتیەکان بە شێوازێکی زانستی و خێـرا لـەناو بردنـی ئـەو نشینگانەی کەلەناودەچن لەبەرنەبوونی پێداویستیەکانی بەردەوامبوونی لەگەڵ ڕۆژگـاردا ، هەروەها بەرەو پێشبردنی ئەو نشینگانەی کەنەخشەی مانەوەی کێـشراوەوبوژاندنەوەیان بە شێوەیێك ببێتە مایەی چڕبوونی جموجۆڵی هاتوچوو تیایدابۆ گەشەکردنی.[٢٣]

لە ژێر ڕۆشنایی ئەوەی باسکرا لێکۆلینەوەی پێکهاتەی بیناکاری نـشینگە دێهاتیـەکان دوو ڕەهەندی هەیە ، یەکەمیان بنیاتنانی خانووی لادێی لەڕووی بیناو شێوەی نەخـشەی . ڕەهەندی دووەمیش تایبەتە بە بنیاتنـانی نـشینگەکان لـە ڕووی پێکهاتـەو شـێوەی پلانـی ،هەروەها پەیوەستە بەو زەوییەی کەلەسەری بنیاتنراوە و بنچینەی ئابووری، ئەمە لەلایـەك و ئەوەی پەیوەندی بە نشینگەکانی ترەوە هەیە لە ڕووی لێکچوونی یا جیـاوازی، یـا لـە ڕووی پێگەوشوێنی لەلایەکی ترەوە. بۆیـەش چـەندلایەنێك هەیـە دەبێـت لێکۆلێنـەوەی لەسەربکرێت بەووردی ئەمەش پێش ئەنجامدانی هیچ ئەندازەیەك یا پلانێکـی دێ نـشینی ، کە گرنگترینیان : –

١– رووپێوی شوێنی (المسوحات الموقعیە):

بەمەبەستی گەیشتن بەکۆمەلێك زانیاری ووردی پەیوەندار بە پێگەی گوندو ژینگـەی دەورووبەری . پێگەش (الموقع)لێرەدا ئەو شوێنە دروستەیە کەنشینگەکەی لەسەر دروست

دەکرێت. لە کاتێکدا شوێن ( الموقع ) مەبەستمان لێی تێگەیشتنێکی فراوانترە بۆ شوێن کە ئایا لەرووی زەوی دەوروبەری نشینگەکەیە یاخود لەرووی نشینگەکانی ترەوەیەو زەوییە نزیکەکانی. دەکرێ پێگەیەك ناوچەیێکی تەخت یا شاخاوی بێت لەوانەشە بکەوێتە بناری چیایەك یا نزیك دەریاچەیەك، لەوانەشە شوێنەکە پەراوێز بێت (هامشی) یا نزیکی سەنتەرە شاریەکان بێت یا رێگاو بانەکان لەگەڵ ئەو کاردانەوی بەسەر نشینگەکاندا دەیسەپێنێ .

لەکاتی پلاندانانی دێ نشینی، گرنگە بە دادواچونێك بۆوێنەی دابەشبوونی جوگراف نشینگەکان بکرێت و نەخشەی بۆ ئامادە بکرێ .لێرەدا گرنگی شوێن بە دیاری دەکەوێ لە پەیوەندی بە جۆری دابەشبوون و بە دیارخستنی سیستەمی دابەشبوون کەلەمەو پێش پلانی بۆدانراوە .

٢ – گرنگی دان بە شێوەی نشینگە :

شێوەی نشینگە دەچێتە ژێر کاریگەری جۆرەکانی بە کارهێنانی زەوی و پەیوەندیە شوێنیەکان و ئاسانی کردارو جێ بە جێ کردنی پێشبینیکردن .لەم بوارەدا سوود وەرگرتن لە دەرامەتە خۆمالیەکان شتێکی پێویستە بۆ پلان و نەخشەسازی خانوو.

٣– رووپێوی دانیشتوان(المسوحات السكانيه) :

مرۆڤ لە پرۆسەکانی دێ نشینی ،ئامانج و ئامرازە، لەژێر رۆشنایی قەبارەی دانیشتوان ژمارەو قەبارەی خێزان و تایبەتمەندیەکانی دیاری دەکرێ و دواتر سروشت و شێوەی نشینگەکە.

هەروەها شیکردنەوەو تیگەیشتنی ئارەزووەکانی دانیشتوان بەشێکی گرنگە لە پرۆسەکانی نیشتە جێبوونی دانیشتوان یا بنیا تنانی نشینگەی تازەوخراپی تێگەیشتنی ئاواتەکانی دانیشتوان و ئارەزووەکانی بووە مایەی کۆمەلێك گرفت لە پرۆژەکانی نیشتەجێ بوون لە ناوچەجیاجیاکانی جیهاندا.[٢٤] گومانیش نیە کەمرۆڤ خاوەن سوودە لە بەکارهێنانی زەوی لە رێگەی بەکارهێنانێکی تایبەتی لە کاتی هەڵبژاردنی شوێنی خانووی

ڕەچاوی بەرژەوەندی خۆی دەکات. هەروەهاڵە کاتی دابین کردنی خانووەکان و بە یەك بە ستنەوەی لەگەڵ ناوچەکانی دراوسێی یا دەوروبەری لەگەڵ پێشکەوتنی شارستانی فاکتەری مرۆیی کاریگەرتردەبێت و شوێن پەنجەی دیارتردەبێت .لە کاتێکدا ڕەهەندی مرۆیی گرنگترین بەشە کەدەبێ حسابی بۆ بکرێت لەبوارەکانی سوود وەرگرتن لەزەوی ئەوا پلاندان ئەو پێگەیە کە ئەم ڕەهەندە جوجۆڵ دەکا تیایدا بە ئاراستەی هەمەجۆری هاوتەریب لەبەرئەوەی دێ نشینی لە ڕاستیدا بە شێکی جیانەکراوەی بوژاندنەوەی دێهاتە گەرچواچێوەی زانستی نەبێت ئەوا ژینگەی دەوربەری جووتیارکە کاریگەرە بە سەریەوەو ناکرێ جیابکرێتەوە لەژیانی ڕۆژانەی لەکێڵگەی یا باخچەی ، بۆیەش بەردەست خستنی پێداویستیەکانی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی ئامانجی چاوەڕوان کراوی خۆی بەجێ ناهێنێت یا رادەی ئابووری و کۆمەلایەتی پێویست ، گەرئاراستە نەکری بەرەو بەردەست خستنی پێداویستیە گرنگەکانی بژێوی و جێنشینی جووتیار .

گرنگ لێرەدا ڕەهەندی مێژوویش بایەخی پێی بدرێت لەو بوارەدا بەتایبەتی دێ نشینی بە جۆرەکانی ئێستاکەی لەدایکبووی ماوەییەکی درێژی نیشتەجێبوونە، کەوێنەی جیاوازی بە خۆوە بینی تاوەکو گەیشتۆتە وێنەی ئێستا و بە پێی ڕاستیە مرۆیەکانی دەکرێ ڕەهەندی قووڵی مێژوویی کەپشت بەبنچینەی شارستانی ئەو وولاتە دەبەستێ بە دیار بخەین ،کەکاریگەرە بەسەر دیاردەو جۆری دێ نشینی .[٢٥]

دەکرێ ئەو فاکتەرەو کاریگەریانەی پەیوەند یان هەیە بەپلانداناني دێ نشینی بەم شێوەی خوارەوە دەستنیشان بکەین[٢٦]:

١-فاکتەری سروشتی :-

کەبریتیە لە :

ا-کاریگەری فیزیۆگرافی لەرووی رادەی تەختایی زەوی و پلەی بەکەڵك هاتنی و ئەوەی کاریگەرە بەسەرشێوەی نیشتەجێبوون و نەخشەکانی

ب-کاریگەری کەشووهەوا /لەرووی باروودۆخی کەشووهەواو رەگەزەکانی ئەوولآمدانەوەی کەدێتەئاراوە بەهۆی خۆگونجاندن لەگەلٌ ئەم باروودۆخە.
ج-کاریگەری جیۆلۆجی /کەتایبەتەبەسیفەتەکانی خاك و توانای خۆراگرتنی بۆبیناکردن وریژەوی ئاوی ژێرزەوی.
٢-فاکتەری ئابوری : -
لەنێوانیاندا:
ا-سەرچاوەکانی داهات و جۆروجۆری چالاکیە ئابووریەکان ودابەشبوونی بەسەردانیشتوان.
ب-ئاستی داهاتی تاکەکەسی ،کەرەنگدانەوەی ئاستی بژێوی وئاستی خۆشگوزەرانیەودواترئەمەش کاردەکاتەسەرجۆری خانووقەبارەی
ج-دروستکردنی کەرسەی بیناکاری وپێشکەوتنی و رادەی بەردەست بوونی ،کە یارمەتی باشترکردنی جۆری بیناکاری وبەرزکردنی ئاستی دەدات گەربەردەست بێت.
٣- فاکتەری کۆمەلآیەتی : -
کەبریتیەلە :
ا-ژینگەی کۆمەلآیەتی لەرووی بەها کۆمەلآیتیەکان و لایەنە رۆشنبیریەکان و داب ونەریتی کۆمەلگاوئارەزووی تاکەکەسی.
ب-تایبە تمەندی دانیشتوان لەرووی قەبارەوپێکهاتەی دانیشتوان وپێوەرەدیموگرافیەکان.
ج-چالآکیەکانی پەیوەندداربەفێرکردن وتەندروستی و حەوانەوە.
٤-پلانی دەولەت لەرووی دانیشتوانەوە: -
ئەمەش پەیوەستە بە هەموونەوئامانجانەی کەدەولەت نەخشەی دەکێشی بۆجێ بەجێکردنی پرۆژە بوژاندنەوەییەکان لەناوچە دێهاتیەکاندا کەئەمەش پلانێکە پشت بە سروشتی پەیرەوی ئابووری کەدەولەت جێ بەجێ دەکات لەهەموولایەنەکان.

هەندێك وولات هەیە کەدەرگا والا دەکات لەبەردەم چالاکیە دێهاتیەتایبەتیەکانی بەبێ مەرج ،لە لەدەرئەنجامدا جیاوازی پەیدا دەبێت لەبۆچونەکانی تایبەت بەچۆنیەتی چارەسەرکردنی جێنشینی. بەلام ئەودەولەتەی کەهەولی بایەخدان بەدێهات دەدات، دەبێ پلان ونەخشەی دێنشینی دابنێ لەگەل رەچاوکردنی هەموولایەنەکانی ئابووری و خزمەتگوزاری، بەشێوەیێك کەپەیوەست بێت بەشێوەیکی توند بەسەنتەرەکانی شاری دراوسێی ،کەئەمەش گرنگی خۆی هەیە بۆبەرەو پێشبردنی دێهاتی لەرێگەی پتەوکردنی پەیوەندی نێوان ناوچە دێهاتیەکان و ناوچە شاریەکانی دراوسێ.

## سەرچاوەو پەراوێزی بەشی چوارەم


١- بروانه : فؤاد محمد الصقار، التخطيط الاقليمي، الاسكندرية،١٩٧٧،ص٩.

٢- صلاح الدين الشامي، الجغرافية دعامة التخطيط، منشاءة المعارف ،الاسكندرية،١٩٧١،ص١٧٨.

٣- خليل اسماعيل محمد، انماط الاستيطان الريفي في العراق،المصدر السابق،ص٣٥٣.

٤- بروانه: محمد عاطف غيث، دراسات في علم الاجتماع القروي، دار المعرفة الجامعية، الاسكندرية، ١٩٨٦،ص٣٥٩.

٥- خليل اسماعيل محمد، المصدر السابق،ص٣٥٩.

٦- بروانه : عبد الرزاق البطيحي وعادل عبدالله خطاب ،المصدرالسابق،ص١٥١.

٧- جامعة الدول العربية، مجلس وزراء الاسكان والتعمير العربي، المعايير التخطيطية والتصميمية واهميتها في السياسة الاسكانية ،بغداد،١٩٨٦، (مطبوع بالرونيو)ص١.

٨- المصدر نفسه .

٩- صلاح الدين الشامي، المصدر السابق،ص٨٤.

١٠- بروانه: محمد حجازي ، المصدرالسابق،ص٢٠٧.

١١- بروانه: المصدر نفسه ،ص٢٢٥-٢٣١.

١٢- صلاح العبد، التوطن وتنمية المجتمع بالوطن العربي، جامعة الدول العربية،القاهرة،١٩٧٣،ص٧٣.

١٣- بروانه: البطيحي ،ص ١٥٦.

١٤- المصدر نفسة، ص ١٥٦-١٥٧.

١٥- فؤاد محمد الصقار، المصدر السابق،ص٣٠٢.

١٦- المصدر نفسة، ص٣٠٣-٣٠٤.

١٧- توتو كوكوكافي، تجارب التوطين في نطاق المشروعات الاقتصادية الكبرى في السودان، ندوة المعايير الكمية ،بغداد،١٩٨٦،مطبوع بالرونيو،ص٣٢

١٨- بروانه: محمد عاطف غيث، المصدر السابق،ص ٣٦٦.

١٩- عدنان البدراوي، دراسة حول معايير الاسكان الريفي في العراق(١٩٢١-١٩٨٣)،المؤسسة العامة للاسكان، بغداد، ١٩٨٤،ص٤.

٢٠- منذر الاعظمي،المعايير الاسكانية ودورها في السياسة الاسكانية، من ندوة المعايير الكمية ،بغداد، ١٩٨٦،ص٤

٢١- بروانه: محمد طلعت عيسى، ص١٥.

٢٢- بروانه: عدنان البدراوي، المصدر السابق،ص ٣١.

٢٣- بروانه: البطيحي ،ص ١٥٢.

٢٤- خليل اسماعيل محمد، المصدر السابق،ص٣٧١.

٢٥- بروانه: محمد حجازي ، المصدر السابق،ص ١٧٨-١٨٩.

٢٦- بۆ زانياری زياتر بروانه: توتو كوكوكافي، المصدر السابق

# بەشی پێنجەم

# لێکۆڵینەوەی گۆڕەپانی لە جوگرافیای دێ نشینی

**پێشەکی**

لێکۆڵینەوەی مەیدانی یا گۆڕەپانی بابەتێکی تازە نیەو بە تەنها پەیوەست نیە بە جوگرافیا، بەڵکو خەسڵەتێکە لە خەسڵەتەکانی زانستی نوێ، کە یەکەم شت پشت بە دیتن دەبەستێ ( المشهاده ) دواتر تێبینی وورد ( الملاحظه الدقیقه ) ئەمجا تۆمارکردنی دیاردەکان.کە پاشان لێکۆڵینەوە لەسەر فاکتەرە کاریگەرەکان و شیکردنەوەی دەست پێ دەکات بەمەبەستی گەیشتن بە راستی زانستی.

لێکۆڵینەوەی گۆڕەپانی لەلای جوگرافیزانەکان دیراسەکردنێکی بنەرەتیە بۆ زانستی جوگرافیا لە واقیعداو بنەچەی هەموو لێکۆڵینەوەیەکە کە دەکرێ دواتر بابەتی تری لێ بەدەرکەوی.گومان نیە کە راستڕین خوێندنەوە بۆ جوگرافیا خوێندنەوەی واقیعە بە زەوی و ئاووهەوا و دانیشتوانیوە پاڵ پشت بە پێوەروئامارو داتاکانی تری بەکارهاتوو لە لێکۆڵینەوەی پراکتیکی (عملی). [١]

**خۆئامادەکردن بۆ لێکۆڵینەوەی گۆڕەپانی :**

لەبەر ئەوەی لێکۆڵینەوەی گۆڕەپانی تێچوونی کات و توانا و پوڵی گەرەکە ،بۆیە پێویستی بە خۆ ئامادەکردنێکی تەواو هەیە بۆ سوودد وەرگرتن لە و سێ رەگەزەی باسکرا بە شێوەیەکی چاك.پیش دەست پیکردن کارەکە ، هەندیك هەنگاوی ئامادەکاری دەکرێ کەیارمەتی دیاریکردنی ئاراستەی لێکۆڵینەوەی گۆڕەپانی دەدات وئەوزانیاریانەی کە پێویستە بە دەست بهینری تیایدا ، ئەم هەنگاوانە ش ئەمانەن: [٢]

١- گەران بەدوای کتێب و گۆڤارە زانیستەکان و ئامارەکانی پە یوەست بە بابەتەکەوە لە بەر ئەوەی زانین (المعرفه) تەنها قورغ نەکراوە بەکەسیکەوە یامیللە تیکەوە بۆیە شتیکی ئاساییە توێژەر لێکولینەوەی لێکچوو یا نزیك لە و بابەتەی کە لێکولینەوەی لە

سەر دەکات یانوسین لەسەر ئەوشوێنەی کە سەردانی دەکات بدوزیتەوە .لێرەدا پێویستی بوون بەدیراسەکردنی هەموو ئەو بابەتانەی لەسەر ناوچەی لێکولێنەوەی نووسراوە بە دیار دەکەوی،کاتیك تویژینە وەکەی لە ریگەی دووبارە بوونەوە ( تکرار ) بەدوور دەخات وبەشێوەیەك کە بگاتە دەرئەنجامی تازە و پوخت کە لە تویژینەوەکانی پیشوتر باس نە کرابیت .

٢- دارشتنی پلانی لێکولینەوەکە بە گشتی و دواتر پلانی ئیشکردنی گۆرەپانی :

لە لیکوڵینەوە ئەکادیمیەکان و پراکتیکیەکان تویژەر ناتوانی ریگای راست دەست نیشان بکات بۆکۆکردنەوەی داتاکان و شیکردنەوەی دواتر گەیشتنی بە دەرئەنجامی دروست، بەبێ هەبوونی پلانێکی تەواوکار کە لەسەری بروات وریگە نیشاندەری بێت تاوەکو بگات بەئامانج.پلانی لێکوڵینەوەش بەگشتی ئاراستەی بەرەو ئەو لایەنە دەبات کە دووری بخات لە لێکچوویی و دووبارە بوونەوەو ئاستێکی چاکی پێ بدات.پلانی گۆرەپانیش وەکو دەرئەنجامێکی پلانە گشتیەکە دەبی بگونجی لەگەڵی و بەووردی داریژری بۆ ئەوەی بتوانین هەموو زانیاریەکان کۆبکەینەوە بەبێ کەم وکوری و بەپێی خشتەیەکی دیاریکراو کەکات و تواناو پولی سەرفکراومان بۆ کەم بکاتەوە. هەر کەمتەرخەمیەکیش لەم لایەنە وادەکات تویژەر سەردانی گۆرەپانی زیاتر بکات کە لەوانەیە نە کات و نە پولی بەردەستی نەبێت بۆیەش لەوانەیە هەڵی چاکی لەدەست بچێت کە دەکرا بەشێوەیەکی چاکتر بەکارهێنرابا.

٣- شارەزابوونی سروشتی ناوچەی لێکوڵینەوە :

بۆ گەیشتن بە دەرئەنجامی چاکتر، تویژەر دەبێت شارەزاییەکی باشی هەبێت بەو ناوچەی کە بەنیازە کاری تێدابکات.لە رووی بارودۆخی سروشت ( رووی زەوی – ئاووهەوا – ئاو – خاك- جیولوجیا – رووەکی سروشت ) هەروا دەبێت لایەنی مرۆیی شارەزا بێت لە رووی چالاکیەکانی رۆژانەی وداب ونەریت وتیگە یشتنی شارستانی و

ئاستی روشنبیری ناوچەکە تاوەکو بتوانی پلانیك بۆ کاری گورەپانی دارێـژی بـەپێی هـەڵ ومەرجی پیوێیست کە بیگەینێتە ئەنجامی باش.

رێگاکانی ئەنجامدانی لێکوڵینەوەی گۆڕەپانی:

کاتیك جوگرافیزانیك نیازی ئەنجامدانی توێژینەوەیکی گۆڕەپانی دەبێـت ، پێویـستیەتی سـەردانی ناوچـەکە بکـات وچوارچـێوەیەکی گـشتی بـۆ دارێـژی بـەپێی دیـاردەی لێکولێنـەوەی، کـە دواتـر هـەنگاوەکان دەسـت پێـدەکات بـۆ کۆکردنـەوەی هـەموو ئەوراستیانەی کە پێویستە بۆ دەرخستنی ئەوتوێژینەوە بـە شـێوەیەکی زانـستی و بابەتیانـە. لێکوڵینەوەی گۆڕەپانی هەنگاوێکی گرنگ و بنەرەتیە بۆ ئەم دەسکەوتە.[٣]

لێکوڵینەوەی گۆڕەپانی بە چەند ڕێگایەك ئەنجام دەدرێ لەوانە :

١- ڕووپیوکردن لە ڕیگای دیتنی ڕاستە وخۆ .

٢- ڕووپیوَ کردن لە ڕیگای ڕاپرسی .

٣- ڕووپیوَ کردن لە ڕیگای چاوپێکەوتن .

١- ڕووپیوکردن لە ڕیگای دیتنی ڕاستە وخۆ :

یەکیکە لە گرنگترین هەنگاوەکانی لێکوڵینەوەی گۆڕەپانی کە لە ریگەیەوە دەتـوانری ئاشنای ناوچەی لێکولینەوە و بابەتی تویژینەوە بین.هەروا لە ریگەی ئەمە توێژەر دەتـوانی هەمولایەنی دیاردەکانی ببینی و هەستی پی بکاکە شاراوەبوو لە کاتی لایەنی تیـوری لـە کتیب و گوڤار وسەرچاوەکانی تری کتیبخانە،ئەمە لە لایەکەوە لە لایەکی تـرەوە توێـژەر لە ڕاستی ئەوزانیاریانەی لە بەردەست دایە دڵنیادەبی بەم شیوەیە[٤].

ئامـادەبوونی ڕاسـتە وخـۆی توێژەرلـەگورەپانی گرفتـی لێکولینەوەکـەی وتێبینیکردنـی دیاردەکان لە ڕێگەی هەستیارەکانی (حواسە)ئەمانە وایانکردووە نەخشەکانی بـەکارهێنان زەوی ئامرازێکی باوو پەسەندکراوی دارشتنی زانیاریـەکانی ڕووپیـوی دیتنـی ڕاسـتەوخۆ بێت لەگۆڕەپانی لێکولینەوە . توێژەریش دەتـوانی ئامـانجی خـۆی بەدەسـت بێنـێ لـە و

ئامرازە بە سوودە لەرێگەی وێنەکیشانی چەند جۆرێك لە نەخشەی تایبەت بە بەکارهێنان زەوی لە ناوچەی لێکولێنەوە. [٥] ئەم جۆرانەش ئەمانەن :

١- نەخشەی بەکارهێنانی زەوی بە مەبەستی کشتوکالکردن .

٢- نەخشەی بەکارهێنانی زەوی بە مەبەستی نیشتە جێبوون .

٣- نەخشەی بەکارهێنانی زەوی بە مەبەستی بەخێوکردنی ئاژەڵ .

٤- نەخشەی بەکارهێنانی زەوی بە مەبەستی پیشەسازی کشتوکالی .

دەبێ ئەو نەخشانەی کە توێژەر وێنەیان دەکیشی، پێوەری گەورە بێت،لە نێوان ١ : ١٠٠٠٠ و ١ : ٢٥٠٠٠ .هەروەها دەبێ توێژەر نەخشەکان قەڵەبالغ نەکات بە دیاردەکان تاوەکو بتوانی جیایان بکاتەوە وشیکردنەوەی دروستیان بۆ بکات .

٢- ڕووپێوکردن لە ڕێگای ڕاپرسی :

دوای هەڵبژاردنی نموونە (عینە) توێژەر دەتوانی لێکولێنەوەی گۆڕەپانی تەواوبکات لە ڕێگەی ڕاپرسی کەیەکێکە لە ڕێگاکانی ڕووپێوکردن.لە چاکەکانی ئەم ڕێگەیە کات وتواناییکی زۆر دەگیرێتەوە،چونکە فۆرمی ڕاپرسیەکە دەکرێ دابەشی سەر کۆمەڵێکی گەورە بکرێ وەکو ئەوەی قوتابی بێ یا لە بازاڕدا یا لە ڕێگەی پۆستەوە دەتوانرێ بگاتە جێی مەبەست.بۆ ئەوەی چاکترین سوود لەم شێوازە وەرگرین دەبی ئالۆز نەبێت وپرسیارەکانی ئاسان و ڕوون بێت وزۆر وەڵامی نەبێت بۆ ئەوەی توێژەر ئەنجامی دروست وزانستی بە دەست بێنی.[٦] هەروەها دەبێت فۆڕمەکە دوورکەوێتەوە لە لایەنە کەسیەکان کەوا دەکات کەسەکە ئارەزووی وەڵامدانەوەی نەبێت.چونکە ئەم ڕێگەیە بە پەلەی یەکەم پشت بە وەڵامدانەوەی خەلکی دەبەستی بۆ پرسیارەکان.توێژەریش گەرویستی ئەنجامی وورد بە دەستبێنێ دەبێ فۆڕمەکان بەبێ داواکاردنی ناوو بێت ونهێنی بێت کە دەبی ئەمەش لە خوارووی فۆڕمەکە ئاماژەی پێ کرابێ .

٣- ڕووپێوکردن لە ڕێگای چاوپیکەوتن : ئەوەی تایبەتە بە راپەرسی،بەهەمان شێود پراکتیك دەبیـە سەر پرۆسەی چاوپیکەوتن.جگە لەوەی توێژەر بە شێوەیەکی راستەو

ـاری ووەڵامەکان تۆمار دەکات بە خودی خۆی لێرەدا پێویستی بەقسەکردنی

ێنانەدی پرسیارو گفتوگۆکردن ووەرگرتنی بۆ چوونی کەسی بەرامبەر دەبێت

ـ بخاتە ئامانجی خۆی. (۷) چاوپیکەوتنی راستەوخۆش دووجۆرە: داریژراووکە پیشووتر ئامادەدەکری وشێوازیکی ریکی هەیە وپرسیارەکان بۆ هە موو کەسەکان ئاراستە دەکریَ بەبیَ دەستکاریکردن.بەڵام جۆری دووەم کە هەرمەکیە پشت بە دارشتنیکی پێشەکی نابەستیت .ئەم ریگە یە چەند خراپەییکی هەیە،ئەویش لە رووی تیچوونەوە گرانە لەبەر پیویستی گواستنەوەی بەردەوام وخەرجیکردن وکاتی زۆردەبات.هەروا هەندیك تۆیژەرلەوانەیە نەتوانی بەشێوەیەکی ریَك وپیك چاوپیکەوتن ئەنجام بدات ووەلامی هەلە تومار بکات.جگە لە مانەش خەلکی بەشیوەییکی گشتی ئارەزووی وەلامدانەوەی پەرسیار ناکەن ( بەتایبەتی لە ولاتانی دواکەوتوو). (۸)

هەندیك نمونەی لیکۆلینەوەی گۆرەپانی لە جوگرافیای دیَ نشینی(۹): –

١ – لیکۆلینەوەی گۆرەپانی بۆ شێوەو پیشەی گوند .

٢ – دیراسەکردنی بەرەو پێش چوونی میژوویی گوندەکە .

٣ – دیراسەکردنی گرنگی گوندەکە لە نێوان دیهاتی دەوروبەری .

## تەوەرەی یەکەم / شێوەو پیشەی گوند

یەکەم / ئامرازەی پێویستەکان :

١ – نەخشەیەکی بنەرەتی گوندەکە بە پێوەری گەورە ( ١ / ٥٠٠ ، ١ / ١٠٠٠ ، ١ / ١٠٠٠٠) .

٢ – لیستێك بە جۆری بەکارهێنانی زەوی مەزەندە کراو لە ناو گوندەکە ، وەکولە خشتەی خوارەوە دیارە .

## خشتەی ( ١ )

## جۆری بەکارهێنانی زەوی مەزەندە کراو لە ناو گوندەکە

| هێما | بەکارهێنان | هێما | بەکارهێنان |
|---|---|---|---|
| ا | بەنق | گ | ئۆفیسی پۆلیس |
| ب | بینای گشتی | ڤ | ئۆفیسی تر |
| ت | شوێنی چاوەروانی کە رەڤانە ( مقگورات سکنیە ) | ع | خانووی ئاوەدان |
| پ | بینای گشتی ( غەیری خانوو) | غ | خانووی وەرزی |
| ج | هۆلی سینەما | ق | قوتابخانەی سەرەتایی |
| ح | دیوەخانی گوند ( هۆلی گشتی ) | ف | قوتابخانەی ناوەندی |
| خ | زەوی کشتوکالی | ك | قوتابخانەی دواناوەندی |
| د | دەزگای فێر کردنی سوارچاکی و ئیستبلەکانی | ل | شوێنی پاسەکان |
| ر | گۆڕستان | م | شوێنی گشتی ڕاگرتنی ئۆتۆمبیل |
| ز | بنکەی تەندروستی | ن | زەوی بەکارنەهاتوو |
| س | ڕووبەری سەوز ( یانەکانیش دەگرێتەوە ) | ھ | کتێبخانە |
| ش | یاریگای تۆپی پێ لەگەل بیناکان | و | کارگەی ئیش پێکراو |
| ص | باخچە گشتی یەکان کە یاری مندالانیش دەگرێتەوە | ی | کارگەی ئیش پێ نەکراو |
| چ | ئۆفیسی فەرمی خۆجێیەتی | ا/ | شوێنی تایبەتی |

٣ – لیستێك بە جۆرى دووكانە بازرگانیەكان ، كەلە خشتەى خوارەوە دیارە ..

خشتەى ( ٢ )

لیستێكى مەزندەكراو بۆ جۆرى دووكانە بازرگانیەكان

| هێما | بەكارهێنان | هێما | بەكارهێنان |
|---|---|---|---|
| ١ | دووكانى كۆنە فرۆشى | ١٦ | شوێنى فرۆشتنى سووتەمەنى |
| ٢ | دووكانى فرۆشتنى كتێب | ١٧ | دووكانى فرۆشتنى كەل وپەلى باخچە |
| ٣ | دووكانى هەویركارى | ١٨ | دووكانى فرۆشتنى دیارى |
| ٤ | قاوەخانە | ١٩ | سەرتاشخانە |
| ٥ | دووكانى كەل و پەلى ماڵ | ٢٠ | نووتوچى |
| ٦ | دەرمانخانە | ٢١ | زێرینگر |
| ٧ | دووكانى فرۆشتنى جل و بەرگ | ٢٢ | دووكانى فرۆشتنى رۆژنامە و گۆڤارەكان |
| ٨ | كۆمەڵگاى بازرگانى | ٢٣ | ئۆفیسى پۆستە |
| ٩ | دووكانى خزمەتكردنى تاكەكەسى | ٢٤ | شوێنى فرۆشتنى پێلاو |
| ١٠ | دووكانى دروست كردنى جل و بەرگ | ٢٥ | شوێنى چاك كردنى پێلاو |
| ١١ | دووكانى پاك كردنەوەى ووشك | ٢٦ | دووكانى فرۆشتنى كەل وپەلى وەرزشى |
| ١٢ | دووكانى كەل و پەلى كارەبایى | ٢٧ | دووكانى فرۆشتنى شیرنەمەنى |
| ١٣ | چێشتخانە | ٢٨ | دووكانى فرۆشتنى ئامێرى كارەبایى |
| ١٤ | دووكانى كەل و پەلى ڕاو كردن | ٢٩ | دووكانى فرۆشتنى یارى |
| ١٥ | دووكانى میوەجات | ٣٠ | ئۆفیسى گەشت و گوزار |

## دووەم / كارى گۆرەپان

پشت بەستن بە نەخشەكە ، لە ناو گوندەكە دەسوڕێنەوەو بەكار هێنانى زەوى لەسەر بنەماى نهۆمى خوارەوە تۆمار دەكەین، هەروەها بەكارهێنانى زەویەكراوەكان ئەمەش لە رێگەى لیستى پێشووتر . لە هەرخانووێك یا رووبەرێكى بەتاڵ جۆرى بە كارهێنان

دەنووسین لە ڕێگەی بە کارهێنانی نیشانەکانی پێشووتر. ئەمە جگە لەوەی لێکۆڵەر دەبێت بیناکان ودەزگاکانی تازەش زیاد بکات کەلەوانەیە دوای دەرچوونی نەخشەکە کرابێت،بەرامبەر ئەوەش ئەو خانوودەزگایانەی کە نەماون دەبێ بسرێنەوە .

سێیەم / دەرخستنی زانیاری لەکاری گۆڕەپانی :

١ – نەخشەیەکی وورد دروست دەکرێ بۆ دەرخستنی جۆری بەکارهێنانی زەوی لە گوندەکە . لێرەشدا جۆرە جیاوازەکانی بەکارهێنانی زەوی دەکەینە چەند دەستەییك (فئە) لەگەل تێبینی کردنی ئەوەی کە هەندێك بەکارهێنان دەچێتە ژێر زیاتر لە دەستەییك، دواتر بڕیار لەسەر گرنگترین بەکارهێنان ئەدەین لەگەڵ دیاریکردنی هۆیەکەی و تەرزەکانی بەکارهێنان ڕەنگ دەکرێ یا سێبەر دەکرێ لەسەر نەخشەکە بەپێی خشتەی خوارەوە .

خشتەی ( ٣ )

دابەش بوونی قەبارەیی و تەرزەکانی سێبەر ( ڕەنگ ) و ڕیزبەند و دابەش بوونی ڕێژەیی بەکارهێنانی زەوی لە یەکێك لە گوندەکان

| ڕەنگ | ڕیزبەند | ڕێژەی ٪ | ژمارەی یەکە | بەکارهێنان |
|---|---|---|---|---|
| زەرد | ١ | ٨٥ | ٦٤٩ | نیشتە جێ بوون |
| زەرد | ٢ | ٧ | ٥٣ | بازرگانی |
| سەوز | ٣ | ٣ | ٢١ | خزمەتگوزاری کۆمەل |
| سوور | ٤ | ١,٦ | ١٢ | خزمەتگوزاری پیشەیی |
| شین | ٥ | ١,٤ | ١١ | گەشت گوزاری |
| پورتوقالی | ٦ | ١,٣ | ١٠ | ڕووبەرە چۆلەکان |
| ڕەمادی | ٧ | ٠,٧ | ٥ | کارگە |
| بونی | – | ١٠٠ | ٧٦١ | کۆی گشتی |

٢ – هەژمارکردنی گرنگی جۆرە جیاوازەکان لە بەکارهێنانی زەوی لە گوندەکە،لێرەدا وەزیفەکان لە چەند چینێك ریزبەند دەکەین بە پێی ژمارەیان ودواتر ڕێژەی هەریەکەیان بۆکۆی گشتی دەردەکەین بۆ بەراوورد کردنی وورد لە نێوان ئەم گوندەو گوندی تر .

٣- شێوەی بەیانی دروست دەکەین بۆ ئەوەی گرنگی جۆرە جیاوازەکانی بەکارهێنانی زەوی لە گوندەکە دیاربکەین ، ئەمەش پشت بەستن بەو ڕێژانەدەبێت کە لە خشتەی رابردوو دەرمان کردووەو بەبەهای گەورە دەست پێ دەکەین هەرستوونێکیش بەرەنگێك دەکرێ کە لە خشتەکەدا دیارە و دواتر کلیلی نەخشەزیاد دەکەینەسەر نەخشەکەو ڕێژەکەش گرنگی هەربەکارهێنانێك دیاری دەکات .

٤ – دیاریکردنی ناوچە پیشەییەکان لەسەر نەخشە،ئەمەش لە ڕێگەی بەکارهێنانی پەڕی تەنك.لێرەدا ناوچەی بینا دیاری دەکەین –کە لە نەخشەکەدا دیارە- جەخت لەسەر چەند گروپێکی تایبەتی لە بەکارهێنانی زەوی و پیشەکان لە سنووری ناوچەی ئاوەدانکراوو سیفەتێکی تایبەتی پێ ئەدەین وەکو ناوچەی شت کڕین(منگقە التسوق shopping area) بۆ زیاتر روونکردنەوەی ناوچە پیشەییەکان لە گوند،تۆڕێکی چوار گۆشەیی وێنە دەکێشین لەسەر پەڕێکی تەنك کە رووبەرەکەی ١٠٠م ٢ بۆهەرچوارگۆشەیەك کەئەمەش پەیوەستە بە پێوەری نەخشە،دواتردایدەبەزێنینە سەر نەخشەکە،بڕیار لەسەر بەکارهێنانی سەرەکی لە هەر چوار گۆشەیەك دەدەین وهەریەکەیان بەرەنگی تەرزی بەکارهێنانی سەرەکی رەنگ دەکەین. ڕێگاو جادەکانیش بەبێ ڕەنگ جێ دەهێلێن لە کۆتایش وەسفێکی پشتێنە سەرەکیەکانی بەکار هێنانی زەوی دەکەین،شێوەی ( ٤ ).




شێوەی ( ٤ ) نەخشەیەك بۆ تۆڕێکی زانیاری کە ناوچەپیشەییەکان لە گوندێك بەدیاردەخات

## چوارەم / دەرخستنی ئەنجامەکان :

ئەمەش لە ڕێگەی وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە دەبێ : –

١– وەسفی تێبینی و ئەنجامەکانی کەبەدەست کەوتوون لە نەخشەو خشتەو وێنەی بەیانی دەربارەی شێوەو پیشەی گوند بکە .

٢– باسی پیشەو گرنگی گوندەکە بکەو هۆکارەکانی ئەم گرنگیە .

٣– دەست نیشانی باشترین شوێنی لەباربکە بۆ نیشتە جێ بوون و حەسانەوە و هۆکاری ئەم هەڵبژاردنە .

٤– تێبینیەکان و ئەنجامەکانت بەکار بهێنە بۆ تاقیکردنەوەی ئەم مەزەندانەی خوارەوە :

ا – ئایا گوندە گەورەکان ئاسانکاری زیاتر بۆ دانیشتوان بەر دەست دەکات لە گوندە بچووکەکان ؟

ب – ڕادەی چاکی بیناکاری چەندە کەدەکرێ پیشەی گوندەکە لەدوایدا هەمە جۆربێ ؟

ج – ڕادەی جێ بەجیکردنی پێویستیەکانی خزمەتگوزاری دانیشتوان .

د – گەر خزمەتگوزاری گەورە بکرێ ، ئایا داهاتی ئابووری دەبێت ؟.

٥– دەکرێ پەیوەندییەك لە نێوان دانیشتوان و پیشەکان لەناو گوند و هەندێك لایەنی جوگرافی بەدەرخەین . هەروەکو بەستنەوەی نێوان نەخشەی بەکار هێنانی زەوی و نەخشەی بەزری ونزمی، یا پەیوەندی تێکڕای لێژی و بەکار هێنانی زەوی و دەکرێ ڕێگەیەکی خێرا بەکار بێنین بۆ دیاریکردنی لێژی لە ڕێگەی تێڕوانینی نەخشەیەك کە پێوەری١/ ٢٥٠٠٠ یا ١ / ٥٠٠٠٠ .

ا – ئەگەر دووری لە نێوان هێلی کەنتۆری ( ١ملم ) بوو لێژیەکەی ( ١ / ٥ ) بەپلەی ٢٠ ٪ .

ب – ئەگەر دووری لە نێوان هێلی کەنتۆری ( ٢ملم ) بوو لێژیەکەی (١ / ١٠ ) بەپلەی ١٠ ٪ .

ج – کاتێکیش دووری نێوان هێلی کەنتۆر ( ١ / ٢ سم) بوو ئەوا تێکڕایی لێژی ( ١ / ٢٥ ) بە پلەی ٤ ٪ .

دەکرێ چەند چینێکی تەنیشتی بکرێ بۆ دیارکردنی پەیوەندی نێوان جێگەو پیشە.لێرەدا وێنەی هێلێکی تەنیشتی لەسەر نەخشەی بەکار هێنانی زەوی دەکێشین ولەگەڵ بەکار هێنانی نەخشەیەکی کەنتۆری لێکچوو لە پێوەر، چینێکی بەرزی و نزمی بۆ پێگەی گوند دەکێشین لە هێلی دیاریکراووچینەکەوینە دەکەین ودرێژبوونەوەی بەکارهێنانی زەوی جیاواز لەسەر دابنرێت هەروەکو لە شێوەی ( ٥ ) دیارە . هەروەها دەکرێ پەیوەندی نێوان پیشەو پێکهاتەی جیۆلۆجی بەهەمان ڕێگەی پێشوو دیاری بکەین چونکە ئەمەش کاریگەریەتی هەیە بەسەر شێوەی گوند.




**شێوەی ( ٥ ) چینێك کە پەیوەندی نێوان پێگەو ناوچە پیشەییەکان دیاری دەکات لە یەکی لەگوندەکان**

# تەوەری دووەم

## بەرەو پێشچوونی مێژووی گوند

**یەکەم / ئامرازەکانی لێکۆڵینەوە :**

بەرلەلێکۆڵینەوە دەربارەی بەرەو پێشچوونی مێژووی گوند ، دەبێ شارەزایەکی باشی تەرزەکانی بیناکاری ( معماری ) هەر قۆناغێکی مێژووی بین.لە پێش سەدەی نۆزدەمداریگاو بانەکان خراپ بوون و هاتووچۆکردن زەحمەت بوو ، بۆیەش تەرزەکانی بیناکاری زۆر خۆماڵی بوو بەڵام لەگەڵ بەرەوپێشچوونی هۆیەکانی گواستنەوە تەرزەکانی بیناکاری فراوان بوولەناو یەك وڵات بە پێی خەسلەتەکانی هەرکاتێك.لە ئەورووپا -بۆ نموونە- هەندێك تەرزی ئاشکرا بەدی دەکەین کە : جۆرجی و ڤیکتووری ماوەی نێوان هەردوو جەنگ وماوەی دوای جەنگ دووەم . ئامرازەکانی لێکۆڵینەوەش بریتین لە :

١- نەخشەیەکی بنەرەتی بە پێوەرێکی گەورە : ١ / ٥٠٠ یا ١ / ١٠٠٠ یا ١ / ١٠٠٠٠ .

٢- لیستێك بە ماوەی بیناکان،وەکو ئەوەی لە هەندێك وڵاتی ئەورووپایی:

New . لە جەنگی جیهانی دووەم =

INT . ماوەی نێوان هەردوو جەنگ =

Vic . ماوەی ڤیکتووری =

Geo . ماوەی جۆرجی =

Oid . ماوەی پێش جۆرجی =

٣ – لیستێك بەکەرەستەی بینا ،وەکو :

بینای دروستکراو لە کەرپوچی سوور

▓ بینای دروستکراو لە بەرد

Ω بینای دروس کراو لە دار

T دیاریکراو نیە

دووەم / کاری گۆڕەپانی :

لەم قۆناغەدا دەست دەکرێ بە گەڕان لە ناوکۆلانەکانی گوندەکەو بەراوورد دەکرێ لەگەڵ نەخشەکەو داتاکانی تایبەت بەئەو کاتەی کەبیناکراوە تیایدا تۆمار دەکرێ وهەروەها کەرەستەی بینای سەرەکی.دەکرێ لێرەدا پشت بە چەند دیاردەیەك (معالم) ببەستین کەلەوانەیە مێژووی بینای لەسەر تۆمار کرابێت وەکو پردوو مزگەوت و هەندێك بینای سەرەکی.هەروەها پشت بەچەند بەڵگەیەکی ناوچەکە دەبەستێ یا ن نەخشەی کۆن و وێنەی فۆتۆگرافی کۆن ، جگە لەوانەی باسکرا چاو پێکەوتنی راستەوخۆ لەگەڵ بەتەمەنەکانیش هەیە بۆ کۆکردنەوەی زانیاری دەربارەی ئەم لایەنانە.

سێیەم / دەرخستنی زانیاری لە لێکۆلینەوە گۆڕەپانیەکە :

١- نەخشەیەکی وورد دروست دەکرێ بۆ دەرخستنی بەرەوپێشچوونی مێژووی گوندەکە،بیناکان لێرەدا بەو نیشانانە سێبەر دەکرێ بەپێی نیشانەی هەرماوەیەك لە ماوەکانی بیناکردنی هەرجۆرێك. سێبەری تۆخ بۆ ماوەی کۆن بەکار دێت دواتر سێبەرەکە کاڵتر دەکرێت لەگەڵ تازەبوونی بیناکاریەکەوئەمەش لەکلیلی نەخشە دیار دەکرێ.پێویستە کۆنترین خانوو لە گوندەکە بەسێبەرێکی تایبەتی رەنگ بکرێت دواتر وەسفی نەخشەکە دەکرێ وشی دەکرێتەوەزانیاری تازەی دەخەینەسەر لەگەڵ دەرخستنی سەرچاوەکەی هەروەها ئەو دیاریدانەی کەنەماون لادەبری.

٢ – دروستکردنی نەخشەیەك بۆ کەرەستەی بینا ، ئەمەش لەسەر نەخشەیەکی بنەرەتی تازە کە تیایدا بیناکان سێبەر دەکرێن بەپێی کەرەستەی بینای سەرەکی .

٣- دیاریکردنی پەیوەندی نێوان کەرەستەی بیناو ماوەی بیناکردن،ئەمەش لەرێگەی ئامارکردنی ژمارەی بیناکان لەهەر ماوەیەکی دیاریکراوودەبێت.دواترژمارەی بیناکان لەهەر ماوەیەك بەپێی کەرەستەی بینا دابەش دەکرێ و خشتەیەکی تایبەتی بەمە دادەنرێت.دەکرێ ئەمەش لە شێوەیەکی بەیانی بە ستوونی دابەشکراووهەر ستوونێك تایبەتە بەماوەیەکی تایبەتی و دابەش دەکرێ بەپێی کەرەستەی بینا.لە کۆنەوە دەستی پێی

دەکات وبەرەو تازە دەڕوات ستوونەکان بەهەمان سێبەری بەکار هاتوو لەنەخشەکە ڕەنگ دەکرێن کارەکەش بە وەسف کردنێکی ئاماری و کارتۆگراف کۆتایی دێت لە ڕووی شوێن و کاتدا .

٤ – وەسف کردنی ئەو گۆڕانکاریانەی لەکەرەستەی بینادەکرێ لە مێژوودا لێرەدا پەیوەندی نێوان کەرەستەی بینا و کاتی بینا کردنی خانوو دیاری دەکرێ بەبەکار هێنانی نەخشەو شێوەی بەیانی لە شیکردنەوەی.هەولی ئەوەش ئەدەین هەندێك هۆکاربەدەر بخەین کە بۆتە مایەی گۆڕانکاری ودەکرێ ئەم زانیاریانەش بەدەست بێنین لە ڕێکەی لێکۆلینەوەی گۆڕەپانی و چاوپێکەوتن.

چوارەم / نووسینەوەی دەرئەنجامەکان :

ئەمەش لەڕێگەی : –

١ – وەسفکردنی بەرەو پێشچوونی مێژووی گوندەکە ودیاریکردنی ماوەکانی گەشەکردنی خێرا و گەشەی خانوو هەروەها بەرەو پێش چوونی ئاوەدانی دیاردەکەین بە پێی ئاراستەسەرەکیەکان .

٢ – دەر خستنی پەیوەندی نێوان مێژووی بیناکردنی خانوو کەرەستەی بینای بەکارهاتوو لەماوەیەکی دیاریکراو هەولێ ڕوون کردنەوەی هۆیەکانی پەیوەندی.لەگەڵ بەهەندوەرگرتنی بەهای کەرەستەی بینا وهۆی گواستنەوەی وشێوازەکانی بینای پەیڕەو کراو لەو کاتەدا .

٣ – ماوەی ١٠٠ ساڵ دەگرینەوەلەگوندەکەو ئایا کامە دیاردە دەکرێ بهێلینەوە لە گوندەکەو کامەش دەمانەوێ لەناوی بەین یان چاکی بکەینەوە .

٤ – دیاریکردنی ئاسانکاری وئەو بەکار هێنانەی کە دەکرێ زیاد بکرێ لە گوندەکە بۆئەوەی زیاتر لەبەر چاوبێت .

٥– هەولی تاقیکردنەوەی ئەومەزەندانە ئەدەین .

١ – ئایا ئەو بینا کاریانەی کەلە پێش مێژووی ( س ) کراون بەکەرەستەی خۆمالیە ؟

ب –ئایا بیناکاریە کۆنەکان دەکەوێتە سەنتەری گوندەکە ، دواتریش بەشەتازەکان لە دەوری گەشەی کردووە .

ج – گوندەکە ئایا بیناکاری دێرینی تێدایە ؟ ئایا نۆژەنکراوە ؟

د – ئایا فاکتەری ڕاکێش ( جذب ) هەیە لە گوندەکە ؟ سەرباری بوونی وەکو جێگەیەکی نیشتەجێ بوون و خزمەت گوزاری .

<u>پێنجەم / ڕاسپاردەو ڕێنماییەکانی تر:</u>

١ – دەکرێ سوود لە سەر ژمێرییەکانی دانیشتوان وەر بگرین ، بۆ شارەزابوون لە مێژووی گوندەکە .چونکە ووردەکاری دانیشتوانی و جێنشینی دابەشکراوو بەسەر مێژووی سەرژمێریەکان .

٢– کۆتایی ناوی دێهاتەکان ئاماژە بەبنەچەی پەیدا بوون دەکەن ، بۆ نموونە گوندەئینگلیزیەکان ئەوانی کەبە ton-ham-ing کۆتایی دێت ئاماژە بەبنەچەی ئەنگلۆ سەکسۆنی دەدات،لە کاتێکدا ئەو ناوانەی بە thoree-byکۆتایی دێت بنەچەکەی دەگەڕێتەوە بۆdanes.هەروەها دەکرێ پشت بەناوی شوێنەکان ببەسترێت بۆ ئاشنا بوونی مێژووی گوندەکە .

٣ – دیارکردنی شوێنی هاتنی کەرەستەی بیناو سەقفەکان ، دەکرێ ئەمە لە سەرنەخشەیەکی پێوەر بچووك دیاری بکرێ و چۆنیەتی گواستنەوەی بینا هەوڵ ئەدەین لە کاتە جیاکاندا دەست نیشانی بکەین .

٤ – ڕاسپاردە دەخەینە بەرچاوی لایەنە بەرپرسەکان لە چاککردنەوەو پاراستنی چەند بەشێك لە گوندەکە کە دەکرێ نۆژەن بکرێتەوە .

٥ – ئەو ئاراستانەی کە دەکرێ گوندەکە فراوان بێ تیایدا دەخەینە بەر چاوو هۆکارەکانی دیاردەکەین هەروەها کەرەستەی بینای تازەوداهاتووی گوندەکە لەم ڕوانگەیەوە .

# تەوەرەی سێیەم

## دیاریکردنی گرنگی گوندەکە لەگەڵ دێهاتی دەوروبەری

**یەکەم / ئامادەکردن و ئامرازەکانی لێکۆلینەوە :**

ئەم لایەنە بایەخ بە روونکردنەوەی ڕادەی گرنگی گوندەکە لە هەرێمی دەوروبەری ئەدات . دواتر راپۆرتێکی سەرەتایی دەربارەی گرنگی گوندەکە بۆ دانیشتوانی دێهاتی ونشینگە دێهاتیەکانی پەیوەندار، لەم ڕوانگەیەوە دەکرێ ئەم ئامرازانەی خوارەوە بەکار بێت : -

١- نەخشەیەکی بنەرەتی بە پێوەری ( ١ / ٥٠٠ ، ١ /١٠٠٠ ، ١ / ١٠٠٠٠ ) کە سنووری کارگێریەکانی لەسەر دیاری کراوە .

٢- لیستێك دەربارەی جۆرەکانی بەکار هێنانی زەوی .

٣ - لیستێك دەربارەی شوێنە بازرگانیەکان .

٤ - خشتەیەك بۆ تۆمار کردنی سەرچاوەی هاتنی هۆیەکانی گواستنەوە بۆ گوندەکە .

٥ - فۆرمێکی زانیاری بۆ دەرخستنی گرنگی گوندەکە .

٦ - خشتەیەك بۆ هەژمارکردنی گەشتیارەکان .

**دووەم / کاری گۆرەپانی ، کەوا باشە بە چەند قۆناغێك پەیرەو بکرێ :**

- دابەزاندنی زانیاری لەسەر نەخشە ، ئەمەش لە ڕێگەی سوڕان بەناو جادەکانی گوند بۆ تۆمار کردنی بەکار هێنانی زەوی و دووکانە بازرگانیەکان ....هتد .

٢- چاو پێکەوتن ئەمەش لەگەڵ چەندین کەسایەتی گوندەکە وەکو ، بەڕێوەبەری قوتابخانەکان ( بۆزانینی سەرچاوەی قوتابیەکان ) هەروەها بەرێوەبەری یانە خۆمالیەکان ( بۆ زانینی سەرچاوەی ئەندامەکان ) و هەروەها کارگێری ئوتێلەکان ( گەرهەبوو ) بۆ زانینی ئەو کەسانەی کە دێنە ئەوێ ، جگە لەمانەش دەکرێ چاو پێکەوتنی لەگەڵ دووکاندارەکان ( بۆ زانینی سەرچاوەی کاڵاوناژەڵ و ....هتد ) و شوێنی پاسەکان ( بۆ

زانینی گەشتیارەکان دابەشکردنی فۆرم بەسەریاندا بۆ روون کردنەوەی هەندێك لایەنە گرنگەکانی گوندەکە سەبارەت بەدەورو پشتی ) . دەکرێ ئەم فۆرمە بەم شێوەیە بێت :

**فۆرمی ڕاپرسی دەربارەی گرنگی گوند**

١ / ناوی دێ : سەنتەر: پارێزگا:

٢/ زانیاری کەسی :

ا – ناو :

ب – تەمەن :

ج – باری کۆمەلایەتی :

د – باری زانستی :

ه – ژمارەی تاکەکانی خێزان :

و – داهات :

ز – شوێنی نیشتە جێ بوونی پێشووی :

٣– وەلامی ئەم پرسیارانە بدەوە بەو هەڵسەنگاندنەی خوارەوە لەبەرامبەر هەر پرسیارێك

| هەلسەنگاندن | زۆرباش | باش | گونجاو | نزم | زۆر نزم |
|---|---|---|---|---|---|
| نمره | ٥ | ٤ | ٣ | ٢ | ١ |

ا – بۆ چوونت چی یە دەربارەی دووکان وخزمەتگوزاریە پیشەییەکان ( دەرمانخانە – دکتۆر)

ب – بۆ چوونت چی یە دەربارەی ئاسانکاری حەوانەوە ( یانەکان – یەکە کۆمەلایەتیەکان )

ج – بۆ چوونت چی یە دەربارەی ئاسانکاری گەیشتن بۆ گوندەکە لە هەرێمی دەورو بەری .

٤ – هۆکاری گرنگی گوندەکە چی یە ؟ بە ( ئا ) یا ( نا ) وەڵامدەوە بەرامبەر هەر پرسیارێك :

ا – لەبەر بە هێزی پەیوەندیە کۆمەلایەتی یەکان ( )

ب – لەبەر جۆری نیشتە جێ بوونی بەردەست ( )

ج– لەبەر شێوەی گشتی گوندەکە. ( )

د – لەبەر ئاسانی هاتووچۆ کردن ( )

ه – لەبەر کارکردن ( )

و – لەبەر کڕین ( )

٣ / دیراسەت کردنی هاتووچۆ کردن،لێرەدا قەبارەی گواستنەوی گشتی بۆ گوندەکە دەخەینە ڕوو لە ڕێگەی هاتووچۆکردنی پاسەکان و شەمەندەفەرو دیاریکردنی سەرچاوەکەی.هەروەها لە کاتی قەڵەبالغی دەکۆلینەوە وەکو لەبەیانی زوو یا ئێوارە سەبارەت بەگەشتی ڕۆژانەی کارو ناوەراستی ڕۆژ بۆ کڕیاران و بەکار هێنانی خشتەی ئاماری بۆ ئەم مەبەستە وەکو :

خشتەی ( ٤ ) لێکۆڵینەوەی قەبارەی هاتوچۆوکردنی گشتی

| گەشتیاری ڕۆیشتوو | گەشتیاری هاتوو | تێکڕایی گەشتیاران |
|---|---|---|
| هاتوچۆو کردنی گشتی : | | |
| شوێنی دەرچوون : | کات : | |
| گەشتیاری ڕۆیشتوو | گەشتیاری هاتوو | تێکڕایی گەشتیاران |
| | | |
| | | |
| | | |
| تێکڕا: | تێکڕا: | تێکڕا: |

خشتەی ( ٥ )

خشتەیەکی تۆمار کردنی سەرچاوەکانی ئۆتۆمبیل

| سەرچاوە | ژمارەی ئۆتۆمبیل | ژمارەی پاس | هی تر | ژمارە | تێکرا ٪ |
|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | |
| | | | | | |
| | | | | | |
| | | | | | |

سێیەم / دەرخستنی زانیاری لە لێکۆلینەوەی گۆڕەپانی :

١ – ئامادە کردنی نەخشەیەك بۆ دیاریکردنی مەودای کاریگەری گوندەکە لێرەدا کەشفێکی یەکە کارگێریەکانی گوندەکەو گوندی دەوروبەری لە ڕێگەی نەخشەیەکی پێوەر بچووك ( ١ / ٥٠٠٠٠ ) یان ( ١ / ٢٥٠٠٠٠ ) سەنتەری گوندەکە بە خالێك لەسەر نەخشەی دیاری دەکەین . دواتر هێلەکانی خزمەتگوزاری لەهەموو ئاراستەیەك زیاد ئەکەین پشت بەست بەسەرچاوەی گەشتیارەکان.لێرەشدا ڕەنگ یا سێبەری هەمەجۆر بۆ هێلەکانی خزمەتگوزاری گوندەکە بەکار دێنین ( قوتابخانە ، دووکان ، فەرمانگەی کشتوکالی ، خزمەتگوزاری تر .....هتد،ئەمانەش لە کلیلی نەخشە دیاری دەکرێن ) دواتر پەڕێکی تەنك دا ئەنێین لەسەر نەخشەکە وبە ڕێگەی خال لە کۆتایی هێلەکان دائەنێین دواتر خالەکان دەگەیەنینە یەکتروروبەری نێوانیان دەژمێرین بۆ دیاریکردنی ناوچەی هەر خزمەتگوزاریەك دواتریش بەراوورد دەکەین لە نێوان سنووری ئەو خزمەتگوزاریانەو سنووری کارگێری .

٢ – شیکردنەوەی دەرئەنجامەکانی ڕاپرسیەکە،لە ڕێگەی دارشتن و داتاکانی و دەربرینی بە خشتەو شێوەی ئاماری .

ڕوستکردنی نەخشەیەکی جموجۆل ، بۆ دەرخستنی تەرزەکانی گواستنەوەی گشتی

نووچۆکردنی هۆیەکانی گواستنەووەی گشتی بە شێوەیەکی جێگیر بوولە ڕۆژێکدا دەکرێ هێلەکە بەیەك شێوە بێت،بەلاّم گەر هاتووجمووجۆلەکە جیاواز بوو لە ڕۆژێکدا دەبێ دابەش بکەینە سەر سێ یا چوار ماوەی جیاواز .

٤ – ئامادەکردنی نەخشەی جمووجۆلی گەشتیاران .

٥ – ئامادەکردنی نەخشەی هێلکاری جمووجۆلی ئۆتۆمبیلە تایبەتی یەکان .

چوارەم / دارشتنی دەرئەنجامەکان :

١) لە ڕێگەی کاری گۆرەپانی ئەوە دیاری دەکەین گەر گوندەکە شوێنێکی سەنتەری لەنێوان دەورووبەری داگیر بکات .

٢) هۆکاری بوونی خزمەتگوزاری تایبەتی ئاشکرا دەکەین ( بازاری ئاژەلّ ، کارگە ،......هتد )

٣) گرنگی ئەم لایەنانە بەدیار دەخەین : –

( ا) ئەو ڕووبەرەی کە گوندەکە خزمەتی دەکات وەکو باخچەیەك (متنزه)

(ب) دانیشتوانی شارە دراوسێکانی گوندەکە کە لێی دائەنیشن .

٤) تاقیکردنەوەی یەکێ یان زیاتر لەو مەزاندانەی خوارەوە : –

(ا) ئایا ناوچەی دەسەلاتی پیشەیی گەورەترە لە سنووری کاگێری .

(ب) ئایا گوندەکەتەنها بۆ نیشتە جێ بوون بەکاردێ لەبەر لەدەست دانی هەلی کار .

(ج) ئایا گوندەکە ئاسانکاری هاتووچۆی تیادایە سەبارەت بەو کەسانەی شتی لێی دەکرن یا سەبارەت بە هـ ـوچۆی ڕۆژانەی کار کردن .

پێنجەم / ڕاسپاردەو پێشنیاری تر

١) لێکۆلینەوەی ڕادەی کاریگەری و ئاوێتە بوونی لەگەلّ گوندە دراوسێکانی ، چونکە گرنگی گوندەکە لەم لایەنەوەڕەنگ دەداتەوە وەکو ئەومەودایەی کەکەسێك دەیبڕێ بەمەبەستی شت کڕین یان ئاسانکاریەکانی تر .

سنووری مەودای کاریگەری لەگەڵ گوندەکانی دراوسێی بەناوی ( خاڵی بچرانی ئاوێتە بوون ) دێ ( نقگە القگع التفاعلیە ) هەندێك جوگرافیزانیش ڕایان وابوو کە ئاسانکاریەکانی هەر گوندێك گونجاوملەگەڵ قەبارەی دانیشتوانی . لێرەدا دەکرێ خاڵی بچرانی و مەودای کاریگەری بەم شێوەیە دەربهێنرێ : –

(ا) قەبارەی دانیشتوانی گوندەکە (کە لێکۆلینەوەی لەسەر دەکرێ ) لەگەڵ نشینگەکانی دراوسێی دیاری دەکرێ و هێلی ڕاستی لە نێوانیاندا دەکێشرێ .

(ب) هاوکۆلکەی جوگرافیزانی ئەمەریکیj. Reilly w بەکار دێنین بۆهەژمارکردنی خاڵی بچرانی بەم شێوەیە :

دووری نیوان (ا،ب)

خاڵی بچران لە نێوان ( ا ، ب ) گەر (ا) گەورەتر بوو لە ڕووی دانیشتوانەوە = دووری نیوان (ا،ب)

———————————————

١ + √ دانیشتوانی خاڵی ا/ دانیشتوانی خاڵی ب

دوای دەرخستنی خاڵی پچران دووری لەسەر نەخشەکەهەژمار دەکرێ لە گوندە بچووکەکە لە ڕووی قەبارەی دانیشتوانەوە

بۆ دیاریکردنی ئاوێتە بوون لە نێوان گوندەکەو دراوسێیەکانی پەڕێکی تەنك دائەنێینەسەر نەخشەکەو سەتەری گوندەکە بە خاڵێك دیاری دەکەین.دواتر خاڵی پچڕان لە نێوان گوندەکە وگوندە دراوسێکانی دەکێشین و ئەمجا بەیەکەوەی دەبەستین و ئەو ناوچانەی کە دەکەوێتە سنووری خالەکانی پچران سێبەر دەکەین و لە کۆتایشدا مەودای کاریگەری ئاوێتەبوونی گوندەکە بەدەست دێنین.شێوەی ( ٦ ).

٢) بەیەکەوە بەستنەوەی نێوان دەسەلاتی گوندەکەو تیۆری گوندەسەنتەریەکانی کریستالر.ئەمەش لەرێگەی دووبارە کردنەوەی هەنگاوی پێشوو ودیار خستنی دەسەلاتی گەندەکە لە هەرێمەکەدا ئەمەش دەمانخاتە دۆخێك کە بتوانین بەراووردی نێوان دەسەلاتی

گوندەکان بکەین – بەتەقریبی – لەگەل تیۆری کریستالر دواتریش هۆکاری جیاواز کەر هەبوو دیاری دەکەین .

٣) بەراوورد کردنی گوندەکان لە رێگەی قاعیدە ڕیزبەند – قەبارە بۆ نشینگەکان ئەم قاعیدەیەش وا دەڵێت کەلە هەرێمەکەدا ( گوندی دووەم ½ قەبارەی گوندی یەکەمە ، هی سێیەمیش ٣/١ یەکەمە و چوارەمیش ¼ یەکەمەو بەبەکارهێنانی پەڕی لۆگاریتمی ، لەو کاتەدا ئەو هێڵەی کەلە دەرئەنجامی قاعیدەی ڕیزبەند- قەبارە دێتەکایەوە هێڵێکی ڕاست دەبێت و بە گۆشەیەکی (٤٥ )پلە لە نێوان میحوەری ( س ، ص ) .

بۆ ئەوەی ئەمەش لەناوچەیەکدا تاقی بکەینەوە ، قەبارەی دانیشتوانی هەر گوندێك دیاری دەکەین و دواتر ڕیزبەندیان دەکەین بە پێی قەبارەوهەرئەوهاش دایدەبەزێنینە سەر پەڕی لۆگاریتمی.دواتر بەراوورد دەکەین لە نێوان چەماوەی فیعلی نشینگەکان و چەماوەی قاعیدەی ریزبەند – قەبارە ،لێرەشدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت هەندێك گوند گەورەترەو هەندێکی بچووکترە لە دۆخی مەزەندەکراوی،دواتریش هۆی جیاوازی دیاردەکەین .




شێوەی (٦ ) ریگەی بەکارهینانی خالّی پچران ودیاریکردنی دەسەلاّتی گوندەکە

(ا) دیاریکردنی خالّی پچران لە نیوان دووگوند

(ب) دیاریکردنی ناوچەی دەسەلاّتی گوندەکە بە

(ت)هەژمارکردنی خالّی پچران

(ت)

## سەرچاوەو پەراوێزی بەشی پێنجەم


١- محمد عبد الرحمن الشرنوبي . البحث الجغرافي ، مكتبة الأنجلو المصرية ، القاهرة ، ١٩٧٨ . ص١٢٧.

٢- عادل عبد الله خطاب ، الدراسات الميدانيه في الجغرافية . مجلة الجمعية الجغرافية العراقية ، ع (١١) ، بغداد ١٩٨٠ ، ص ٢٢٧-٢٣٠ .

٣- صلاح الشامي ، الفكر الجغرافي . منشأة المعارف . الإسكندرية ، ١٩٨٠ . ص ٣٦٤ .

٤- محمد علي عمر الفرا . مناهج البحث في الجغرافيا وكالة المطبوعات ، الكويت ،١٩٧٨ . ص ١٠٠ .

٥- صبري فارس الهيتي وآخرون . الفكر الجغرافي وطرق البحث . مطبعة جامعة الموصل . الموصل . ١٩٨٥. ص ٨٥ .

٦- عبد الرزاق محمد البطيحي . طرائق البحث الجغرافي ، دار الكتب . الموصل .١٩٨٨ . ص١١٤ .

٧- صبري فارس الهيتي وآخرون ، مصدر سابق ، ص ٢١٥-٢١٦ .

٨- عبد الرزاق محمد البطيحي . مصدر سابق . ص١١٣ .

٩- بۆ نوسینەوەی ئەم نمونانە سوود لەم کتێبانە وەرگیراوە:

١-Archer, J.E&Dalton, T.H,Fieldwork in Geography,B.T.Botsford Ltd.London,١٩٦٨.

٢-Flowerdew,R&Martin,D.(eds),Methods in Human Geography ,A Guide for Students Doing Research Projects,Longman,Edinburgh,١٩٩٧.

٣-Frew, J. Geography Fieldwork, Macmillan Eduction, London, ١٩٨٦.

٤- Gold ,J .R. etal.Teaching Geography in Higher Education , A Manual of Good practice ,Blackwell,Oxford,١٩٩٣.

٥-Knox,P.I,FieldworkinUrban Geography, Assessing environmental Quality ,Scottish Geographical Magazine,٤٠,١٩٧٠.

٦- Parsons,T.&Knight ,P.G. How to do Your Dissertation in Geography and Related Disciplines, Chapman &Hall,London,١٩٩٧.

وەرگیراوە لە کتێبی :

- حمدى احمد الديب،في جغرافية العمران الريفي (اسس وتطبيقات)،مكتبة الانجلو المصرية،القاهرة،٢٠٠٣،ص١٩١-٢١٠.

# بەشی شەشەم

## دێ نشینی لە هەرێمی کوردستانی عێراق

### پەرەسەندنی مێژوویی نیشتەجێبوون لە کوردستاندا:

کوردستان یەکێ لەو وڵاتانەی سەر رووی زەمین پیك دەهینێ،کەمرۆڤ هەرلەکۆنەوە تیایداژیاوەو بەتەواوی نیشتەجێبوەو ئاوەدانی تێدا دروست کردوە.پشکنینە شوێنەواریەکان و پاشماوە مێژوویەکانی سەلماندوییانەکە مرۆڤ لەکۆنەوە لەم ناوچەیەدا ژیاوەو لەسەرەتادا خەریکی گەڕان و جوجۆڵ بووە بەدوای خۆراك و شوێنی داڵدەی و لەکاتی پێویست و مەترسیدا پەنای بردووە بۆ ئەشکەوت وپەناگەبەردینەکان[1].ئەمەش ئەوە دەگەیینێ کە کوردستانی عێراق،کەش وهەوای بۆ ژیانی کۆمەڵانی خەڵکی سازگاربووەو زەوی بەپیتی زۆری هەبووەو خەڵکی لەدێرزەمانەوە ئەوزەویانەیان چاندووەو لەداروبەردو کەرستەی کشتوکاڵیان دروست کردووە،تا وردەوردە خەڵکی پێکەوەکۆبونەتەوەو پەیوەندی کۆمەڵایەتی و ئابووری لەنێوانیاندا پەرەی سەندووەو لەئاکامدا دەستیان بەئاوەدانکردنەوەودروستکردنی خانوبەرەی خۆیان کردووە[2].

بوونی لەوەڕگای سروشتی دەوڵەمەند بەگژوگیاوخۆراك لەکوردستاندا وادیارە هاندەر بووە لەسەرەتاکانی ژیاندا بۆ ئەوەی خەڵکی خەریکی(شوانکاری) بێت بەڵام دواتر بوونی خاکی بە پیت و کەش وهەوای گونجاوو ئاوی زۆر،ئەمانە هەمووی یارمەتی سەرهەڵدانی(کشتوکاڵ)یان کردو بووە مایەی ناچارکردنی مرۆڤ کە بەدیار زەویەکەیەوە بمێنێتەوە.ئەمەش دروست بوونی گوندونیشتەجێبوونی لێکەوتەوەودیارترینیان گوندی(چەرمۆ)ی کشتوکاڵیە،کەمێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆدەوروبەری(٦٥٠٠)ساڵ پ.ز بەتایبەت لەبناری چیاکان وپێدەشت وبەردەم چیاکاندا،بەم شێوەیە(گوند)بۆتە نشینگەو داڵدەی مرۆڤ وبەرەو بنیاتنانی(ئاوەدانی وشارستانیەت)هەنگاوی ناوە[3].

گوند لە کوردستاندا بووە سیمایەکی بنەرەتی بۆ کۆبوونەوەی خەڵك لەشوێنێکدا و بەچالاکی کشتوکاڵیەوە خەریکبن،لەوانەشە وەرزێرەکە لەپاڵ کشتوکاڵکردندامەرو ماڵات بە خێو بکات ودار برین وپیشەی دەستی گونجاویش ئەنجام بدات.

لە مەوە بۆمان دەردەکەوێت کە دێنشینی قۆناغێکی گرنگی بەرەو پێشچوونی کۆمەڵی مرۆڤەوکاریگەری زۆری هەبووە لە سەر قۆناغەکانی داهاتووی ژیانی رامیاری وئابووری وکۆمەلایەتی کە لە یەك کات و بەیەك شێوەوپلەوەکو یەك گەشەی نەکردووە.لەگەڵ ئەوەی مێژووی بنیاتنانی گوندوئەنجامدانی کاری کشتوکاڵلەناوچەکەدا کۆنە،بەڵام پیشەی سەرەکی نەبووە،بەڵکوشوانکاری و ژیانی کۆچەری تا سەدەی دەیەم لە کوردستاندا شێوەی سەرەکی بووەوجووتیاران تا ئەوکاتە بەشێوەیەکی تەواو جێگایان لەسیستەمی بەرهەمهێنان وکۆمەلایەتیدانەبوو.هەرئەمەش وای کرد کە گەڕیدەکانی ئەوروپی کوردیان هەربەشوانەی کۆچەری دادەنا نەك بە وەرزێری نیشتەجێ‌وبازرگانی بچووك وپیشەگەر.کەئەمە بۆ ئەوساش هێشتا هەر ناتەواو وزێدەڕۆیی بوو جەخت لەسەر شێوازی ژیانی کۆچەرایەتی کورد بکری(٤).

لەسەدەی دەیەم و یازدەمدا لەکوردستان دەرەبەگایەتی کشتوکاڵی هەڵسایە سەرپێ‌ولەقۆناغی پەرینەوەدا لەدەرەبەگایەتی کۆچەر،کۆمەڵێك میرنشین پەیدابوون وئابووری جێگری کشتوکاڵ جێگەی ئابووری ناجێگری کۆچەرانی گرتەوە،کە ئەمەش پێگەی گوندی بەهێز کردودواتر ئابووری تێکەڵ(کشتوکاڵوئاژەڵداری)سەری هەڵدا.دوابەدوای داگیرکردنی عێراق لەلایەن عوسمانیەکانەوە لە ساڵی ١٥٣٤ز دێ نشینی لە کوردستاندا زیانی گەورەی پێکەوت.چونکە لەلایەك شەڕەکانی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و فارسی و سەفەوی لەسەرخاکی کوردستان ئەنجام دەدرا،لەلایەکی تردوە دەرەبەگی کورد دەسەلاتی ڕەهای دەدرایەوەوزەوی بەمیراتگری بۆ نەوەکانی ئەمایەوە(٥).

دوای ساڵی١٩١٨ز ناوچەکە کەوتۆتە ژێردەسەڵاتی ڕاستەوخۆی ئینگلیزەوەو دواتریش تا ڕووخانی فەرمانڕەوای پادشایەتی،لەم ماوەیەدا کوردستان چەندین گۆڕانکاری لەبواری ئابووریو کۆمەڵایەتی وڕامیاری بەخۆیەوە بینیوە.

ئێران سنوورەکانی داخست بەرووی شوانکارانی کوردوناچاربوون خۆیان لە گەڵ هەلومەرجەکە گونجاندووەو بوونە(شوانکارەی کشتیار)کەدواتر وردە وردە نیشتەجێبوون،تائەوکاتیش گوندەکان مەڵبەندی سەرەکی دابین کردنی خۆراك وکەرستەی پیشەسازی بوون،بەجۆرێك بەرهەمە پیشەسازیەکانی گوند بۆ پێویستی خێزان نەبوون،بەڵکو بۆ مەبەستی بازرگانیش بە کارهێنراوە.[٦]بەم شێوەش دواجار ئەم نیمچە کۆچەرانە(إشباه المترحلين)نیشتەجێبوون و بوونەکشتیار.واتە گوندنشین،ئەمە لەرووی ژیانی ئابووری وکۆمەڵایەتییەوە[٧] .

لە شەستەکانی سەدەی رابردوو ساڵانی دواتریش،دێهاتەکانی هەرێمی کوردستان کەوتە گێژاوی بارێکی نائارامی و ڕامیاری وسەربازی وبووە گۆڕەپانی شەڕوپێکدادان ودەرفەتی پەرەپێدانی کەرتی دێهاتی نەدا،بەتایبەتیش لەماوەی نێوان(١٩٨٠-١٩٨٨)کەزۆربەی گوندەکانی کوردستان خاپوور کران و لەسەر نەخشە سڕانەوەوخەڵکەکەش بەرەوئۆردوگا زۆرە ملێکان ڕاگوێزران.

دوای ڕاپەرینی بەهاری ساڵی١٩٩١ز وئارام بوونەوەی رەوشی رامیاری لەهەرێمی کوردستاندا ناوچەکە ئاوەدانکرایەوە،بەڵام بە هۆی نەبوونی پلانێکی زانستی دارێژراو،دێهاتەکان کێشەوگرفتی زۆری تێداهەڵکەوت وهەنگاوی پێشکەوتووانەی نەنا،بەڵکو دووچاری کۆچی پێچەوانەش بۆوە. هۆکاری ئەم حاڵەتەش بەشێکی بەر ئەنجامی سیاسەتی ڕاگواستن وکۆکردنەوەیان بوو لەکۆمەڵگاکاندا،پاشان بێ کاربوون وگۆڕینی شوێنی کاریان،هەندێکی تری پەیوەستە بەکەمی خزمەتگوزاری گشتی،شان بەشانی بارودۆخی دوای ڕاپەرین و سوود وەرنەگرتن لەبڕیاری ٩٨٦ ی ئەنجوومەنی ئاسایش ناسراو بە(نەوت بەرامبەر بەخۆراك)بۆ بەرژەوەندی ئابووری کوردستان.ئەمانە

وایکـــرد کـــە دێهـــات لـــە حاڵـــەتێکی پاشـــکەوتوودا بـــژی و گـــۆڕانێکی چۆنایەتی(نوعی)نەخولقێنی،بۆیە پێویستە پلانێك و بەرنامەیەکی زانستی بـۆ پەرەپێـدانی دێهاتـەکان بگرێتـە بەر،گـەر بمانـەوی لـەو بـارە نـەخوازراوەی دواکـەوتنی دێهـات دەرچین.[٨]

دابەشبوونی قەبارەیی نشینگە گوندیەکان:

دەکرێ بڵێین کە نشینگە گوندیەکان سێ قەبارە لە خـۆ دەگـرێو بریتیـە لـە خـانووی تاك،گوندی بچووك(مۆڵگە)،گوند.خانووی تاك،بریتیە لەچەند کێڵگەیەك کە خانوبـەرەی دوور لەیەکی تێدایە دانیشتوانەکەی ئارەزووی ژیانی نزیك زەویەکانیان دەکەن کەرۆژانـە هاتووچـۆیان هەیـە. ئـەم کێڵگانـە دوورن لەیـەکتری وئاسـانکاری هاتووچـۆکردنی تێدایە.باشترین نموونەی کێڵگەکانی رۆژئاوای ویلایەتە یەکگرتوەکانە یا کەنەدا یاکێڵگەی مەڕومالآت و رەشەوولاخ لە ئوسترالیا.

سەبارەت بەگوندی بچووك دووردا‌هەیە کە دانیشتوانی پەرش وبڵاوە وەکو ئەمـەش لەناوچەی باکووری ئینگلتەرا. ئەم جۆرە بریتیە لـە کێڵگەیـەك یـاخود دووکێڵگـە یـان چەند خانوویەك، جگە لەشوێنی پەرستگاو دووکانی بازرگانیو فەرمانگەی پۆستە کەهـەر بەتەنها گوندەبچووکەکە خزمەت ناکات بەڵکو کێڵگەوخانووەکانی دەورروبەر. گوندیش جـۆری بـاوی ئـاوەدانی گوندنـشینە لەزۆربـەی ولآتـانی جیهـان وبریتیـە لـە خـانوو وکێڵگەوبینایەی گشتی وەکو پەرسـتگاو هـۆڵی ئەنجومـەنی گونـدو چـەندین دووکـانی بازرگـانی ...هتـد.گونـد هەڵدەسـتێ بـە داڵـدەدانی جووتیارانوپیـشەگەرانی تروخزمەتگوزارەکان. جیـاوازی قـەبارەی نـشینگە دێهاتیـەکان پەیوەسـتە بـە کۆمـەڵێك هۆکـاری سروشـتیومرۆیی.نـشینگە دێهاتیەبـچووکەکان چـەندین بـارودۆخی سروشتیومرۆیی پەیدای کردووە لەپێشەوەی هەمووشیان کەمبوونی توانای زەوی لەسەر بژێویکردن،تۆبۆگرافیای زەوی کەبەکەڵك هاتنی بۆ جێنشینیورووبەری کشتوکاڵ دیاری دەکات.[٩]

بەشێوەیەکی گشتی قەبارەی نشینگە گوندیەکان بەچەندین هۆکارەوە پەیوەستە لەوانە:

١ ـ ژمارەی ڕەهای دانیشتوان ،کەبەشێوەیەکی سروشتی کاردەکاتە سەر قەبارەی گوند.لەوناوچانەی کەچڕی دانیشتوانی بەرزە یا قەبارەی خێزانی گەورەیە ،لێرەدا گوندەکە چەند هەزار کەسێك لەدانیشتوانی دەگرێتە خۆو لەسەر ڕووبەرێکی فراوانی زەوی دابەش دەبن.بەڵام لەناوچە کەم دانیشتوانەکان یا مامناوەندەکان گوندەکان ژمارەیەکی کەمی خانوو دانیشتوان لە خۆو دەگرێ.

٢ ـ توانستی هەبوونی زەوی بەکەڵك بۆ دابینکردنی پێویستیەکانی دانیشتوان.چونکە لەکاتێکدا کە زەوی بەکەڵك بۆ کشتوکاڵکردن لە گوندەکان سنووردار بێت ئەوا هەندێك لە دانیشتوانی ناچار دەبێت جموجۆڵ بکەن بۆ شوێنی ترو لەوێ گوندی تازە درووست بکەن وزەوی تازە ئامادە بکەن یا خود بچنە شارەکان بۆ بەدەست هێنانی هەلی کارکردن.هەربۆیەش قەبارەی نمونەیی بۆ گوند هەیە ،کەبگونجێ لەگەڵ ئەنجامدانی چالاکی لەشوێنەکە.

٣ ـ قەبارەی گوندەکە زۆرجار پەیوەست دەبێت بە پلانی داڕێژراوی پێشووی گوندەکە، لێرەدا ئەوەندە خانوو بنیات دەنرێت بەپێی ژمارەی مەزندەکراوی دانیشتوانی کارکەر لە گوندەکە.

٤ ـ قەبارەی گوند کاریگەردەبێت بەقۆناغی بوژانەوەی دێیەکە.یا بەگۆڕانی دانیشتوانی گوند کەبەپێی فاکتەری دەرەکی دەگۆڕدرێن.گەر گوندێکی تازە دروستکراو بێت ئەوا قەبارەی بچووك دەبێت بەبەراورد لەگەڵ گوندەکانی دەورووبەری لە هەرێمەکە ،بەڵام بەشێوەیکی کاتی دەبێت هەروەها گۆڕانکاریەکانی دانیشتوان وادەکات کە گوندەکە گەشەبکات یا لەناوبچێت .هەروەها گۆڕانکاریە کشتوکاڵیەکان هەندێ جار وادەکات کەمبونیك لە ژمارەی دانیشتوان ڕووبدات .جگە لەمانەش نزیکی لەسەنتەرەکانی شارستانی وادەکات ژمارەیێك لە دانیشتوانی غەیرە وەرزێر رابکێشێ بۆخۆیو بەم شێوەیەش قەبارەی گوندەکە گەورەدەبێت.

٥ ـ لەکاتێکـدا کـە قـەبارەی گوندەکـە لەرێگـەی ژمـارەی خانووەکانودانیـشتواندا بەدیاردەکـەوێت.ئـەوا رووبـەری ئەوگوندانـەی کەقەبارەیـەکی هاوشـێوەی دانیـشتوان لـەخۆدەگرێ جیـاوازی دەبیـت بـەپێی جیـاوازی شـێوەی دێرینـی گونـدو دابەشـبوونی خانووەکانی.ئەگەر بێت وخانوی گوندەکـە باخـچەی لـەدەوری هـەبوو ئـەوا گوندەکـە رووبـەرێکی گـەورەتر داگیردەکـات بەپێـچەوانەشەوە گـەر نـشینگەکە کۆوەبوویێـتو دانیشتوانی لەیەك یا دوو ریزی خانووی هێلکرد نیشتەجێ بن.

زۆربـــەی گونـــدەکانی ئەفریقیاوئـــەوروپا خانووەکانیـــان لەناوەڕاســـتی زەوییـــە کشتوکاڵیەکانیان کۆدەبیتەوە.لەکاتێکدا لە ئەمریکای باکوور کێلگە تاکەکان بلاووترین شێوەیە.

٦ ـ لـەکۆتایی قـەبارەی گونـد دەچـێتە ژێرکاریگـەری سروشتەوە،چـونکە لەوانەیـە گەشـەکردنی گوندەکـە راوەسـتێت لـە ئاراسـتەیەکی دیـاریکراودا لەبـەر ئاسـتەنگێکی سروشتی وەکو زەلکـاووگرد و دارسـتان....هتـد.بۆیـەش گونـدی چیایی و زەلکـاوو لەهەموو لایەکەوە سنووردار دەبێت بۆیەش کۆدەبێتەوە.(١٠)

دابەشبوون بەپێی تێکڕای قەبارە:

نـشینگە گوندیـەکانی کوردسـتانی عێـراق لــە ئــەنجامی گــۆڕانی دیمـوگرافی وکارگێریورامیاری کەبەسەری هاتووە وایکردووە کەگۆڕانی کـاتی وشـوێنی گـەورەش بەسـەر ژمارەوقەبارەکانیانـدا بێـت.لەسـەیرکردنی خـشتەی ژمـارە (٦ ) دەردەکـەوێت ژمارەی نشینگە گوندیەکان لە(٦٤٤٥)نشینگەوە کەمی کردووە بـۆ (٥٤٥٠ )نـشینگە لە نیوان ساڵانی١٩٥٧ – ١٩٧٧،کەچی لە ساڵی ١٩٨٧بەشێوەیەکی بەرچـاو ژمـارەی نشینگە گوندیەکان کەمیانکردووە بـۆ تـەنها(١٠٩٨ )نـشینگە.هـۆی ئـەم کەمبوونـەش دەگەرێتەوە بۆ پرۆسـەی وێرانکردنوکۆچـپێکردنی زۆرەملـێ لـە نـشینگە گوندیـەکانی کوردستان.ئەوەی جێگای ئاماژە پێدانە ئەم گۆڕانانە تەنها ژمـارەی نـشینگە گوندیـەکانی نەگرتۆتەوە،بەڵکو شان بەشانیان گۆڕانی بەرچاو بەسەر قەبارەیاندا هاتووە.

## خشتەی ژمارە ( ٦ )

## ژمارەی نشینگە گوندیەکانی هەرێمی کوردستانی ١٩٥٧ -١٩٨٧

| ساڵ | ژمارە |
|---|---|
| ١٩٥٧ | ٦٤٤٥ |
| ١٩٧١ | ٥٤٥٠ |
| ١٩٨٧ | ١٠٩٨ |

سەرچاوە:

١- الجمهورية العراقية وزارة الداخلية، مديرية النفوس العامة،المجموعة الاحصائية لتسجيل ١٩٥٧، سكان القرى لالوية الموصل والسليمانية وكركوك وديالى،دار التضامن،بغداد، ١٩٦١، ص٧-٣٨٩ .

٢- (ا)نافع يعقوب،احصاء القرى وسكان الريف والتعاونيات الزراعية في العراق،المؤتمر الاول للاسكان الريفي في العراق،كانون الثاني،١٩٧٧،دراسة رقم ٩،ص ٢٣-٤٢.

(ب) فريد شمعون ايشوكيشي،تحليل بنية هيكل الاستيطان الريفي،رسالة ماجستير،مركز التخطيط الحضري والاقليمي،بغداد ،كانون الاول، ١٩٩٠،ص١٢٨.عن: خليل اسماعيل محمد، اقليم كردستان العراق(دراسات في التكوين القومي للسكان)، مطبعة كريستال، اربيل، ١٩٩٨،ص١٠٨.

لەسەیرکردنی خشتەی (٧)دەردەکەوێت تێکڕای قەبارەی گوند هەڵبەزودابەزینی بەخۆوە بینیوە،بەجۆرێك لەساڵی١٩٥٧ زتێکڕایی قەبارەی گوند لەهەرێمی کوردستاندا ١١٧ کەس/گوندبووەو هەڵکشاوە بۆ ٢١١ کەس/گوند ساڵی١٩٧١، لەساڵی ١٩٨٢ (٣٥٢) کەس/گوند بووە لەساڵی١٩٨٧ بەرزبۆتەوە بۆ(٤٩٦)کەس/گوند. هۆکاری ئەمەش بەپلەی یەکەم گەڕاوەتەوە بۆ کەمبوونەوەی ژمارەی نشینگە گوندیەکان ساڵ لەدوای ساڵ بەهۆی ئەو فاکتەرانەی پێشتر ئاماژەمان پێکردبوو.

## خشتەی ژمارە ( ٧ )

## تێکڕای قەبارەی گوندنشینی لە هەرێمی کوردستان ١٩٥٧ – ١٩٨٧

| ساڵ | ژمارەی دانیشتوان(کەس/گوند) |
|---|---|
| ١٩٥٧ | ١١٧ |
| ١٩٧١ | ٢١١ |
| ١٩٨٢ | ٣٢٥ |
| ١٩٨٧ | ٤٩٦ |

سەرچاوە:

١- الجمهورية العراقية وزارة الداخلية، مديرية النفوس العامة،المجموعة الاحصائية لتسجيل ١٩٥٧، مصدر سابق .

٢- (ا)نافع يعقوب،مصدرسابق.

ب)الاتحاد العام لنساء العراق،اللجنة الوطنية العليا لاستراتيجية مساهمة المراة فى توفير مياة الشرب والمرافق الصحية فى العراق،الجزء الثالث(الدراسة العمرانية)،بغداد،١٩٨٦،ص١٢.

ج) فريد شمعون ايشوكيشي،مصدرسابق،ص١٢٦. عن: خليل اسماعيل محمد، اقليم كردستان العراق(دراسات في التكوين القومي للسكان)، مصدر سابق.

بەم شێوەیە قەبارەی نشینگە گوندیەکان بەتێکڕای گۆڕانی (-١,١)کەمیکردووە لەنێوان ساڵانی ١٩٥٧ -١٩٧١،ئەم ڕێژەیەش دابەزیوە بۆ (-٥)لە نێوان ساڵانی ١٩٧١-١٩٨٧هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ قەبارەی دانیشتوانی گوندنشین لەم ماوەیەدا.

## خشتەی ژمارە ( ٨ )تێکڕای گۆڕانی ساڵانەی قەبارەی گوند لەهەرێمی کوردستاندا(١٩٥٧-١٩٨٧)

| ساڵەکان | گۆڕانی ساڵانە |
|---|---|
| ١٩٧١-١٩٥٧ | ١,١- |
| ١٩٨٧- ١٩٧١ | ٥- |
| ١٩٨٧- ١٩٥٧ | ٢,٨- |

سەرچاوە :پشت بەست بە سەرچاوەکانی خشتەی ژمارە (٦)

**دابەشبوون بەپێی ڕیزبەندی قەبارە:**

مەبەستمان لێرەدا بریتیە لەریزبەندکردنی نشینگە گوندییەکان بەپێی دەستەی قەبارەیان،واتا دابەشکردنی ژمارەی دانیشتوانی نشینگەکانە بۆ سەر چەند دەستەیەك بێ ڕەچاوکردنی ڕووبەرەکانیان.زۆرجار ئەم دابەشبوونە دەبێتە پێوەرێك بۆ ڕاکێشانی پڕۆژە خزمەتگوزاریەکانو سەنگو بەهای پیگەی سەنتەرەکانی نیشتەجێبوونی پێ دیاردەکرێت،چونکە هەرچەندە نشینگەکان قەبارەیان گەورەتر بێت پیشەی جۆراوجۆر لە خۆدەگرن.[11]

دابەشبونی نشینگە گوندییەکان بۆ چەند دەستەیەك لە هەرێمی کوردستان بایەخوگرنگی خۆی هەیە لە ڕووی چۆنیەتی کاریگەری لەسەر کرداری پەرەپێدان.بۆ ئەم مەبەستەش بەپشت بەستن بەخشتەی ( ٩ ) هەوڵ دەدەین نشینگەکان بۆ چەند دەستەیەك دابەش بکەین وەکولەخشتەی خوارەوەدیارە:

**خشتەی ژمارە ( ٩ )**

**دابەشبوونی قەبارەی گوند لەهەرێمی کوردستاندا(١٩٥٧ ـ١٩٨٧)**

| دەستەی قەبارە | ١٩٥٧ | | ١٩٨٧ | |
|---|---|---|---|---|
| | ژمارەی نشینگە | ڕێژەی ٪ | ژمارەی نشینگە | ڕێژەی ٪ |
| کەمتر لە ٥٠٠ کەس | ٦١٢٧ | ٩٥,١ | ٨٣٩ | ٧٦.٤ |
| ٥٠٠ – ١٠٠٠ | ٢٥٣ | ٣,٩ | ١٣٤ | ١٢,٢ |
| ١٠٠٠ زیاتر | ٦٥ | ١ | ١٢٥ | ١١.٤ |

پشت بەست بە:

١ – الجمهورية العراقية وزارة الداخلية، مديرية النفوس العامة،المجموعة الاحصائية لتسجيل ١٩٥٧، مصدر سابق .

٢ -– فريد شمعون ايشوكيشي،مصدرسابق،ص١٢٧.

- دەستەی یەکەم (کەمتر لە ٥٠٠ کەس )

ئـەم دەســتەیە زۆرتـرین ڕێــژەی کـۆی نـشینگە گوندیــەکانی هــەرێمی کوردســتان پێکدەهێنێت لە ماوەی نێوان (١٩٥٧ -١٩٨٧). لەساڵی (١٩٥٧) زیاتر لە(٩٥,١٪) کۆی نشینگەکانی پێـك هێنـاوە.هەرچـەندە لەســاڵی ١٩٨٧ ئـەم ڕێژەیـە دابـەزیوە بـۆ (٧٦,٤٪) کۆی نشینگەکان.ئەوەی جێگای ئاماژەیە لێرەدا بەرزی ڕێـژەی ئـەم دەسـتەیە کاردانەوەیەکی نێگەتیڤی دەبێت لەسەر کرداری پەرەپێدان،کەئەمـەش ڕەنگدانەوەیـەکی سروشــتی تۆپــۆگرافی ناوچــەکەو کــەمیوزۆری سەرچــاوەکانی ئــاووجۆری چــالاکی گوندنــشینانە،کە کاریگــەری ڕاســتەوخۆیان هــەبووە لــەزۆربوونی ڕێــژەی قــەبارە بچووکەکان.بەشێوەیەکی گشتی چەند بەرەو بەشەکانی چیایی کوردستان بـڕۆین نـشینگە قەبارە بچووکەکان ڕێژەیان زۆرتر دەبێت.

- دەستەی دووەم (٥٠٠ – ١٠٠٠ کەس)

ئەو نشینگانەی کەوتونەتە نێو ئەم دەستەیە هەر لە سـەیرکردنی خـشتەی ( ٩ ) تێبینـی دەکرێ ڕێژەیان زۆر کەمەو تەنها( ٣,٩٪) کۆی نشینگەکانی پێـك هێنـاوە لـە سـاڵی ١٩٥٧ .بەڵام ئەم ڕێژەیە بەرزبۆتەوە بۆ ١٢,٢٪ لە ساڵی ١٩٨٧ .

- دەستەی سێیەم (زیاترلە ١٠٠٠کەس)

ئەم دەستەیە لەساڵی ١٩٥٧ تەنها ١٪ ی لە خۆوگرتـووە، بـەڵام لـە سـاڵی ١٩٨٧ ڕێژەکەی بەرزبۆتەوە بۆ ١١,٤٪.هۆکاری کەمی ژمارەی نشینگەکان لەم جۆرە دەسـتەیە بەبەراورد لەگەڵ هەردوو دەسـتەکەی تـر تارادەیـەکی زۆر دەگەڕێتـەوە بـۆ کاریگـەری سروشتی ئەو گۆڕانە رامیاریو سەربازیانەی کەبەسەر ناوچەکەدا هاتووەو بووەتە کۆسـپ لە بەردەم زۆربوونی ژمارەیان.

## شێوازەکانی دابەشبوونی نشینگە گوندییەکان :

لێرەدا هەوڵ ئەدەین شێوازەکانی دابەشبوونی نشینگە گوندییەکان بخەینە روو،چونکە لەدەست نیشانکردنی شێوازی دابەشوون کاریگەری ئەو فاکتەرانەمان بۆ روون دەبێتەوە،کەکاردەکەنە سەر دابەشبوونی نشینگەکان.

١. شێوازی بڵاوەبوو(النمط المنتشر):

کەگوندەکانی بەشێوەیەکی نارێكو دوور لەیەکترو لێرەولەوێ دابەشبوونە،ئەمەش تارادەیەکی زۆر دەگەڕێتەوە بۆ پشت بەستن بە ئاوی ژێرزەوی کە لەئەنجامی کەمی سەرچاوەی ئاوی سەرزەویەوە دێت بەکۆبوونەوەیان لەدەوروبەری کانیوبیروکارێزەکان.هەروەها بەزۆری لەوناوچانە بەرچاودەکەون کەچیای بەرزودۆڵی قووڵو لێژایی زۆرەو زەوی رێكو کەم تەختی کەمودیاریکراوە.ئەم شێوەیە بەوە دەناسریتەوە کەرێژەی گوندی زۆرەوقەبارەیان بچووکەو بەدەگمەن گوندی قەبارەی گەورەی تێدایە.

٢. شێوازی کۆوەبوو(النمط المتجمع):

کە گوندەکانی بەکۆمەڵی رێك یا نارێك کۆبونەتەوەو کۆڵانەکانیان تەسكوتریسكن خانووەکانی دراوسێ یەکترنو نزیك یەکترن.نشینگە گوندییەکانی کوردستان ئەم شێوازە وەردەگرن زیاتر لە پێدەشتەکانو کەنار رووبارو چەمەکاندا بەشێوەی شەریتی یان لەدەشتی چیاو بنارچیاکاندا.ئەمەش بەمەبەستی داکۆکی کردن لە خۆولە سامانەکانیانو هەروەها بۆ ئەوەی هەموو لایەکیان لە سەرچاوەی ئاوی گوندەکانەوە وەکو یەك دووربن.

### فاکتەرەکانی کاردەکەنە سەر شێوازی دابەشبوون:

١ . فاکتەرە سروشتیەکان:

ئاشکرایە دەشتی دەوڵەمەند بەسەرچاوەکانی ئاو، پەسەندترە بۆ دامەزراندنی سەنتەری نیشتەجێبوون لە ناوچە شاخاویەکاندا.چونکە توانستی کشتوکاڵی بەرزە بۆ

دابینکرنـــی خـــۆراك بـــۆ دانیـــشتوان و گونجـــاوتره بـــۆ چالاكیودەســـتەبەركردنی پێداویـستیەكانی خەلكەكـەی وەك هـەر ئـەوە، بـەلكو لەناوچـە شاخاویەكانیـشدا دەشتەكان(تەسك بن یا فراوان)پەسەندترو خوازراوترن لە لایەن گوندنشینەكانەوە.

لـە هەرێمی كوردستانیش كانیاووبیروكـارێز، بنـچینەی سـەرەكی ژیـانی دانیـشتوانە لەناوچەی چیایی كە لە ٢٥٪ رووبەری داگیردەكات.[١٢]بەلكو ئەو سەرچاوە ئاویانـە بەشێوەیەكی گشتی شوێنگەی نیـشتەجێبوونی دێهـاتی دیـاری دەكات،چـونكە لەهـەر شوێنێك هەبێت گوند دادەمەزرێت.زۆرجاریش قەبارەی گوند پـشت بـە دەولەمەنـدی سەرچاوەی ئاو دەبەستێت دەكـرێ ئـەم سەرچـاوانەش بەرپرسـی جـۆری دابەشـبوونی بلاوەبوو دابنرێ لەناوچەكەداوناوی پەلە تەروشێدارەكان (البقـع الرگبـە)لـەم جـۆرە نشینگانە دەنرێ.[١٣]

لەبەر پارچەپارچەی زەوی كشتوكالْ لەناوچە شاخاوییەكان بەتایبەتی ئەوانەی خـاكی بەپیزو دەشتی بلاوە، گوندی بلاوو سەرهەلدەدا لە ئاستی ناوچەكە. لەناوچەشـاخاویە بەرزو سـەختەكاندا كشتوكالْ رۆلی پلە دووی هەیـە لـە ژیـانی ئابووریولەوەرانـدنو دارستان جێگـەی گرتۆتـەوەو. هـەموو ئەمانـە وایكـردووە پەرەسـەندنی ئـابووری لـە ناوچەی چیاكاندا هێواشتربێ لـە دەشـتەكانو لـە رووی پەیوەندیـەوە بـە ناوچـەكانی دەوروبەری دووچـاری دابـڕان بـن.دەشـتەكانی هـەرێمی كوردسـتان تەسـك بـن یـا فراوان،كارئاسـانی رەخـساندووە لەبـەردەم چـا لاكـی كـشتوكالْ و هۆیـەكانی بەرهـەمهێنانوریگای گواسـتنەوە .بەمـەش ژمارەیـەكی زۆری گونـد لـەم ناوچـانەدا كۆبونەتـەوەو نـشینگەكانیش شـێوازی كۆوەبـوو وەردەگـرن و قـەبارەیان گـەورەترە.دەكـرێ بلـێن كەشێوازی دابەشـبوونی نـشینگە دێهاتیـەكان وقـەبارەیان لەهەرێمی كوردستان بەشێوەیكی گشتی بەبەرزبوونەوە لەئاستی رووی دەریاوە بێ بەبێ لەشێوازی بلاوەبووی قەبارەی بچووك دەگۆرێت بۆ شێوازی كۆوەبوی قەبارە گـەورە

ڕە ئابوورییەکان :

ڕ پێش ئاماژە بەوەکرا کەشێوەی ئاودێری وجۆری بەرهەم هێنانی کشتوکاڵی پەیوەندی هەیە بەدابەشبوون وبڵاوبوونەوەی نشینگە دێهاتیەکان.چونکە ئەمانە کاریگەرن و کاریگەرییان هەیە لەسەر توانای زەوی بۆ بەرهەمهێنانی و بەخێوکردنی ودیاریکردنی ژمارەو قەبارەو شێوازی دابەشبوونی نشینگەکان ورادەی چالاکی ئابووری گوند . شێوەیك پەیوەندی هەیە لەنێوان جۆری کشتوکالکردنی فراوان وجۆری بلاوەی نیشتەجێبون،لەکاتێکدا کشتوکالی ئاودێری بە هەردوو جۆری ،بەرپرسە لەپەیدابوونی جۆری کۆوەبووی نیشتەجیبوون. بەرەو پێشچوون لەبەکارهێنانی ریگاکانی ئاودێری لەکشتوکالدا وایکردووە چڕی نیشتە جێبوون بەرزبێت و گوندەکان قەبارەیان گەورەتر بێت ونزیکتربن لەیەکدی. ئەمەش شتێکی ئاساییەو دەگەڕێتەوە بۆ بەرزی توانای زەوی لەبەخێوکردنی دانیشتوان.

دەکرێ بلێین ئەوفاکتەرانەی کاردەکاتە سەر جیاوازی جۆرەکانی نیشتە جێبونی دێهاتی لەهەرێمی کوردستان لە سروشتی کشتوکالکردن خۆی دبینی کە تەوەری سەرەکی ژیانی ئابووری دێهاتەکانەو گوند لەو شوێنە دادەمەزرێ کە زەوی شیاوی بۆ کشتوکاڵ وئاوی پێویست بۆ خواردنەوەو ئاودێری تێدایە. لەناوچەی شاخاوی کوردستان رووبەری زەوییەکشتوکالیەکان بچوکەو پچڕ پچڕە، بەهۆی کەمی زەوی تەخت وفراوانەوە ،بۆیە زیاتر شێوازی گوندی بلاوو دوور لەیەکی لێ ئەکەوێتەوە وقەبارەیان بچووکە.لەکاتێکدا ناوچەی پێدەشتی کوردستان زەوی کشتوکالی زۆرە بەهۆی تەختی ڕاوانییەوە وگوندەکانی قەوغا بوون ،شێوازی گوندی کۆوەکراوی لێ ئەکەوێتەوەکە قەبارەیان گەورەیە.هەروەها یاساکانی پەیوەندار بە کشتوکالکردن کە ئامانجی جێگیرکردنی مولکداریەتی کشتوکالیەو مافی بەکارهێنانی زەوییە .وایکرد سەرۆك هۆزەکان دەست بەسەر زۆربەی زەوییە کشتوکالیەکان دابگرنوکشتیار بێبەش بکەن لێی ،دواتر دەسەلاتیان بەهێزتر بێت.ئەمەش بووە مایەی پەیدابوونی

نیشتەجێی کۆوەبوو.لە کاتێکدا کێڵگەی خێزانی قەبارەی موڵکداریەتی زەوی کشتوکاڵی سنووردار دەکات و یارمەتی دامەزراندنی قەبارەی بچووك ئەدا،کەبەوە جیا دەکرێتەوە لە جۆری بڵاووە.

۳.فاکتەرە مێژووییەکان:

گومانی تێدانیە رووداوو بەسەرهاتە مێژووییەکان رۆڵێکی گرنگ و ئاشکرایان هەیە لە بواری لەناوچوونی یا دەرکەوتنی، پووکانەوە یا گەشەکردنی نشینگە دێهاتیەکاندا.شوێنەوارو پاشماوە هەمە جۆرەکانی لەشوێنە جیاکانی هەرێمی کوردستان نیشانەی ئەو گۆڕانە بەردەوامەیە کە سەنتەرەکانی ئاوەدانی بەرەو رووی بووەتەوە بەدرێژایی چەرخە مێژووییەکاندا. یەکەم تێبینی کەدیار بێت لە دابەشبوونی گوندی شاخاوی هەرێمی کوردستان دوورکەوتنەوەیە لە ڕێگاوبانە گشتیەکان و گەڕان بەدوای شوێنێکدا کەپاراستن وئارامی زیاتر بێت.ئەم جۆرەش بەرەو رووی زیادبوونی قەبارەی دانیشتوان دەبێتەوە لە بارودۆخی نائارامی لەسەر حیسابی گوندی تر،کەدانیشتوانی چۆڵی دەکەن . (ریچ)یش ئاماژەی بەوە کردووە کاتێك لێکۆڵینەوەی دەربارەی هەرێمی کوردستان کردووەو دەڵێ :((زۆربەی گوندەکانی کوردستان دەکەوێتە ناوچەی دوورەدەست وپاریزراولە دۆڵی دوورلە چاوی دوژمن،تاوەکو ئارامی ودڵنیایی دابین بکەن وجێگیری لێبکەوێتەوە).(١٤) ئەم دیاردەیەش لەناوچەی شاخاوی لوبنان وچیاکانی ئەتلەسیش تێبینی دەکرێ.

بێ گومان هەر کاتێك ئەو هەلومەرجە لەئارادا نەماو ئارامی وئاسایش باڵی کێشا بەسەر ناوچەکەدا.خەڵکەکە دەگەڕێنەوە ناوچەکانی خۆیان و خانووی پەرتوو بلاو لە ناو زەوییە کشتوکاڵیە کانیان دروست دەکەن و ژمارەی گوندەکانییان زۆرتر دەبێ .سەبارەت بەگرنگی فاکتەری مێژوویی ((هنتگتۆن))دەڵێ ((زۆربەی سەنتەرەکانی ئاوەدانی ئێستاکە بنچینەیێکی مێژووی کۆنیان هەیە ،ئەم کۆمەڵگا ئاوەدانیانەی ئێستا بەشێکی کەم وبچووکن لەبەرەنجامێکی مێژووی مەزن).(١٥) گومانیش نیە هەرێمی

کوردستان یەکێکە لە سەنتەرەکانی ئاوەدانی کە پێشینەی مێژووی هەیە وبە ئـاوەدانی ماوەتەوە.

**٤.فاکتەرە کۆمەڵایەتیەکان:**

ئاشکرایە کە داب ونەریتی کۆمەڵایەتی باوو، رۆڵێکـی کـەمتری نیـە لـەو فاکتـەرە کاریگەرانەی کە باسکرا.بەڵکو زۆرجار لێکۆلەرەوان جەخت لەسەر ئـەوە دەکەنـەوە کە ئەم فاکتەرە بەتایبەتی لەولاتانی دواکەوتوو رۆڵێکی سەرەکی دەگێرێ و زیـاتر لـە فاکتەرەکانی تر،کاریگەری لەسەر سروشتی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان ودواتـر جـۆری دابەشبوونی دانیشتوانی نشینگەکانە. هەرچەندەش مـرۆڤ بـەرەو پـێش چـوو لەپلـەی شارستانی کاریگەری فاکتەری کۆمەڵایەتی لاوازتر دەبێت و رێـی خـۆش دەکـات بـۆ فاکتەرەکانی تـر بـۆ ئـەوەی رۆڵـی خـۆی بگێـرێ. لەکاتێکـدا پەیوەنـدی خزمایـەتی بنەمایـەکی کۆوبونـەوەی خێزانـە دێهاتەکانەلـە ولاتـانی عـەرەبی وادیـارە لەهـەرێمی کوردستان،پەیوەندی(خێـڵ)لەسـەر بناغـەی رەچـەڵەك نیـە، بـەڵکو لەسـەر بناغـەی (زەوی)یە ،ئەمەش لە زۆرێك لە گوندەکان کوردستان تێبینی دەکـرێ.بـۆ نموونـە لـە ناوچەی شـارباژێردا نازنـاوی (چوارتای،ماوەش،بەزرنجەیی،سـیوەیلی)وەردەگرێـت یـا بەگشتی نازناوی(شارباژێری)وەردەگرێت .[١٦] ئەو گۆڕانکاریەئابووریەو کۆمەڵایـەتی و رامیارانەی کە لە نیوەی دووەمـی سـەدەی بیـستەمدا هاتەکایـەوە،رۆڵێکی چـالاکی هەبوو بۆ دەر بازبوون لەو پەیوەندی و ئەرکە هۆزایەتیانەی کـە هـەبوون وبالادەسـت بوون بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ لەلای دانیشتوانی دێهات.ئەمەی یارمـەتی ئـەوەی دا، فراوانبوونی تۆڕەکانی گواستنەوەوگەیاندن وبەردەست بوونی هەلی کار ،لەپاڵ یاساو دامەزراوە فەرمیەکان،لەپێشەوەی هەمووشیان یاساکانی کشتوکاڵ.

هەمووئەوانە یارمەتی جموجۆڵی کشتیارانی دا لەگەڵ چالاکیانو دواتـر بووەمایـەی گۆڕانی جۆری بلاوەبون ودابەشبوونیان. هەندێك وای بۆ دەچن کە شـێوازی کۆوەبـو لەدێ نشیندا تەرزێکی کۆن و دواکەتووە وواتای کەمی دەسـەلاتی مرۆڤـە و ملکـەچ

بوونی بۆ داب و نەریتی کۆمە لاتییە لەبەرامبەر دا شێوازی بـلاوە بـوو شـێوەیەکە لـە شێوەکانی ئازادی کۆمەلایەتی.(١٧)

**٥.فاکتەرە رامیارییەکان:**

مەبەسـت سیاسـەتی حکومەتـە ،کـە کاریگـەری هـەبووە لـە سـەر دابەشـبوونی دانیشتوانوکۆکردنەوەیان،هەروەها قەبارەوو پیشەی دانیـشتوان.هـەرێمی کوردسـتانی عێراق دووچاری هەولێ بەردەوام بـۆوە بـۆ لاوازکردنـی ژیـانی ئابووریولەقالبـدانی دانیـشتوانەکەی بەمەبەسـتی گـۆڕینی راسـتی جوگرافیومێـژوویو تێکـدانی بنـەما ئابووریـەکان.کەئەمـەش بەشـێك بـووە لەسیاسـەتی حکومەتـە ناوەندیـەکان بەتایبـەتی لەسـەردەمی دەسـەلاتی بەعـسدا بەئاشـکراو بـەخێرایی لـەکۆتایی حەفتاکانوسـالانی هەشتاکانی سـەدەی بیـستەمدا رەنگیدایـەوەو کاریگـەری زۆر خراپـی هـەبوو لەسـەر دابەشبوونی جوگرافی دێهاتەکان.حکومەتی ناوەندی راگواستنی گوندەکانی خـستبووە چوارچـێوەی ئاسایـشی سـتراتیژیوئەمە وایکـرد کەگونـدەکانی کوردسـتان چـۆڵ بکرێنودواتر جێنشین بکرێن لە ئۆردوگا زۆرە ملیکان(مجمعات قسريه)لەو شـوێنانەی زیاتر دەسەلاتی بەسەریاندا ئەشکا.گومانیش نیە کە جولاندنی کۆمەلگەیەك لـە ژینگـە سروشتیو ئابووریوکۆمەلایەتیکەی کەسالانێکی دوورو درێـژی لەسـەری دەژیـن بـۆ ژینگەیـەکی تـر پێویـستی بـە لێکدانـەوەو وردەکـاریی زۆر هەیە،ئەمـە جگـە لـەوەی کەکاریگەری دەروونی بەجێ دەهێلێت گەرچی ئەو جولاندنە لە هەندێ رووەوە بەرەو باشتری بیات.(١٨)

**خانووی دێهاتی:**

لێـرەدا دەمانـەوێ تیـشکێك بخەینەسـەر نەخـشەی خـانوو لەهـەرێمی کوردسـتان ،هـەروەها ئەنـدازەی بیناکـاری وکەرسـتەی بـەکارهاتوو لـەبیناکردن .ئاشـکرایە کەنەخشەیەکی تایبەتی نیـە بۆنـشینگە دێهاتیـەکان تـاوەکو باسـی لێوەبکـەین ،بـەلکو وەرزێر لەهەرشوێنێك جێگیربوویت خانووی دروست کردووە،لەپاڵ بەکارهێنانی وەکو

دالّدەیــەك بــۆخێزانی وپاراســتنی بەرووبومیوئاژەڵــەكان ،دەبوایــە ئــارامیوجێگری تێدابوایە.ئەم شێوازەش لەبیناكردن ناچێتە ژێر نەخشەیێكی ئەندازەیی دیاریكراو بۆیــەش خانووەكان ڕێك نینەو ڕێگاكانی نێوانیان پێچاوپێچی تەسكەوجاری واش هەیە مــەودای نێوانیان فراوانە لەبەر هۆكاری كۆمەڵایەتیوئەمنی.

نەخشەی خانوو وەك یەك نیە لە كوردستان،چونكە جیاوازی هەیە لەناوچەیەكەوە بــۆ ئەوی ترو لەخانوویەكەوە بۆ خانوویەكی تر لەیەك گوندا.هەنــدێكی ســادەو ســاكارەو هەندێكی ڕێكو نەخشە كێشراوە،هەروەها هەندێكی یەك نهۆمــەو كــەمێكی هەیــە دوو نهۆمی بێ.هەندێك خانووش لە گڵوخشت دروست دەكرێوهەندێكی تر لەكەرپوچ و بەرد.مێژووی دامەزراندنی خانوو دەگەڕێتەوەبۆ ماوەیەكی زۆر كۆن لــە كوردســتاندا، دەوروبەری (١٠٠٠٠) پ.ز هەروەك لەگوندی (زاوی چەمێ ).[١٩] ئەمەش بەڵگــەی ئەوەیە كەئەندازەی خانوو ودێهاتی لە كوردستاندا هەر لــە خــۆڕا نــەهاتووەو كــشتیار شارەزاییەكی كەلەكەبووی (خبرەمتراكمە) هەیە لەنەخشەكێشانی.

خانووی هەرە سادەو هەرەبێ نموودی كورد،بینایــەك بــوو لەیــەك تاكــە ژوور پێــك هاتبوو،خاوەنەكــەی بــەخۆو بەخێزانــەوە تێــدا ســتر دەبــوو، كــۆڕیتێكی بــچووكی هەبوو،هەندێ جاریش لەپشتەوەی خانووەكــە حەوشــەیەكیان بــەكۆتانی دڕاو دەكــردو شەو هەندێ بزنومەریان تێدەكرد.ئەم خانووەش لەگەڵ گەورەبوونی قەبارەی خێزانی و باشبوونی گــوزەرانی خاوەنەكــەی ووردەووردە گــەورە دەكــراو دوای ماوەیــەك وای لێدەهات خانووی دێهاتی هەموو لای دەبوو بەبیناو ژوورو دیوارێكیشیان بۆ دەكرد بۆ ئەوەی شێوەی لاكێشەی تەواو وەربگرێت.[٢٠] ئەم ئەندازەیــەش لــەبیناكردن كــەدواتر بەنەخــشەی ڕۆژهــەڵاتی دەناســرا، بریتیــە لــە حەوشــێكی كــراوە كــە دەورەدراوە بــە ژمارەیەك ژوور كە بۆ كاری جیاجیــا بــەكار دەهــاتو بــە شــێوەیەكی نارێــك دابــەش دەبوونە لەسەر پانتایی ڕووبەری خانوەكە.ڕووبەری خانوو جۆراوجۆرە بەپێی جیــاوازی ناوچەكان،لەپێدەشــتی كوردســتان خــانووە دێهاتیــەكان ڕووبــەریان فــراوانترە لــەوەی

لەناوچەی شاخاوی هەنە.لـە کاتێکـدا لەوانەیـە خانووەکـە لـە دوو ژوور پێـك بێـت کەبەسەر یەکەوەشە بە رووبەرێکی (٤x٧)م[٢] لە ناوچەی شاخاویەکاندا. لە پێدەشـتی نزیك هەولێر،خانووی دێهاتی وەرزێرەکان کە لاکێشەیی (٢٠x١٢)م[٢] یا(٤٥x٣٥)م[٢] بوو.[٢١]بەشێوەیەکی گشتی دەکرێ بڵێین لەگەڵ ئەو جیاوازیانەی هەنـە لـە خـانووی دێهـاتی لـە کوردسـتاندا بـەلاّم چـەندین خەسـڵەتی هاوبـەش هەیـە.لەوانـە هـەبوونی هەیوان،حەوشێکی کراوە لـە ناوەراسـتی خانووەکە،دیوەخانـە،ژووری نووسـتن،هۆری ئاژەڵان .کەئەم پێکهاتانـەی خـانووش جیـاوازن لـە رووی رووبـەرو شـێوازی،بە پێـی جیاوازی قەبارەی خێزانی دێهاتیو ئاستی بژێوی پێداویستیەکانی.



شیوەی ژمارە(٧)شێوەی خانووی دێهاتی

**کەرەستەی بیناسازی:**

خـانووی دیهـاتی رەنگدانەوەیـەکی راسـتەقینەی ژینگـە دێهاتیـە سرووشـتیەکەیتی بەبەراووردلەگەڵ خانووی شاری.چونکە بەکارهێنانی جۆرێکی دیاریکراو لەکەرەستەی بینا پشت بەرادەی بەردەستبوونی دەبەسـتێت لەناوچـەکەداو دواتـر توانـای ئـابووری وەرزێـر لــە هەڵبــژاردنی کەرسـتەیەك بـێ ئـەوی تـر.هەنـدێك لێکۆڵــەرەوان بـۆ جیاکردنەوەی تەرزەکانی هەرێمایەتی بیناسازی پشت بەجۆری کەرەسـتەی بـەکارهاتوو لە دروست کردنی خانوو و شـێوەی ئەنـدازەیی دەبەسـتن، چـونکە رادەی پەیوەنـدیی بەهێزە لەنێوان جۆری ئەم کەرستانەو پێکهاتەکەی ژینگەکەی.

کەرەستەی بینـا بـەپێی کەرەسـتەی خـاووی دروسـتکراو لێـی دەکرێتـە دوو بـەش ،سرووشتیودەستکرد.ئەوەی یەکـەم لــەزەوی دەردەهێنرێتوبەشـێوەیەکی راسـتەوخۆ بەکاردەهێنریێ لەبینا وەکو( گڵ ،قم ،بەرد ،کەرەسـتەی داری).سـەبارەت بـە جـۆری دووەمیش کەرستەی دروستکراو دەگرێتەوە وەکو (کەرپوچ ،چیمەنتۆ ،گـەچ ،ئاسـن ....هتد).[22] سەبارەت بە هەرێمی کوردستانیش،لە بەر جیـاوازی بـەرزو نزمـی بۆیـە کەرستەی بەکارهاتوو لە بیناسازی جیاوازە لە ناوچەیەکەوە بۆ ئەوی تر بەپێی گـۆڕانی ژینگەکەی.لەپێدەشتەکانی کوردسـتان وەرزێرەکان خۆڵ وئاویـان لێکـدەداو بـە پـێ‌ی دەیانشێلا تادەبووە قـورێکی خەستوباشودەخوسـا، ئەوسـا بەخـشتبڕ یـان قالـب بـڕ خشتەکان بەریز لەتەك یەك دەبڕنوبۆ ماوەیەك لێـی دەگـەڕێن تـا لـەبـەر رۆژ ووشـك دەبێتەوە.بروانە وێنەی ژمارە(١٠).



وێنـــــــــــەی ژمارە(١٠)دروستکردنی خشت

بەشێوەیەکی گشتی خۆڵ هەر لەشوێنی دروستکردنی خانووەکـە هەبوو،بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشدا هەندێ جار دەبووابە کەرەستەکانی تری وەکو بـەردودار ...هتـد لـە شـوێنی دوور بێنن.لەناوچە شاخاویەکانی کوردستان ،کەرەسـتەی سـەرەکی بیناسـازی دەبێتـە بەرد،دار بەرووشیان وەکو کەرەستەی بیناسازی بەکاردەهێنا چونکە لـە دار ئەسـپیندار بەهێزترە بەکەلکی کۆلگەی ڕاگرتنی پانی ژێرخانی خانووی چیای دێـت کـەخانووی دوو نهۆمی لیێ دروستدەکرا بەپێچەوانەی خانووی پێدەشتی کوردستان کە ژێرخانووی نەبوو.سەبارەت بەبـەرزایی دیـواری خانووەکـان ئـەوا بـە پێـی بـاری کەشـوهەوا لـە ناوچەیەکەوە بۆ ئەوی تر دەگۆرێ.لە ناوچە شاخاویەکان کە زسـتانی سـاردو بـە بایـە ،خانووەکان نزمن و بە شێکیان چەقیوەتە ناو عەردوپشتی لە بایە،لە کاتێکدا لـە ناوچـە دەشتاییەکان کەوەرزی گەرمی زیاترە ،خانووەکان بەرزاییان دەگاتـە نزبکـەی(٤)م.لـە لێکۆلێنەوەیەکـدا کەلـە سـەر ناوچـەیەکی کوردسـتان کـراوە وادەردەکـەوێت کەکەرستەی(قوڕ)ی بەکارهاتوو لە بیناسازی رێژەی ٧٢٪ کۆی گـشتی کەرسـتەکانی بیناسازی پێکهێناوە بەواتای ٤/٣ خـانووە دێهاتیـەکانی ناوچـەکە پـشتی بـەم کەرسـتە بەستووە لە بینا.لەدوای ئەو کەرستەی بەرد دێـت کەبەشـێوەیەکی تایبـەت لـە ناوچـە شـاخاویەکان بەردەسـتەو وەرزێـر دەتـوانی بەئاسـانی بـەکاریبێنێ کـە بەشـێوەیەکی سرووشتی وقەبارەی جۆراو جۆر هەیە .سـەبارەت بەکەرەسـتەی دروسـتکراویش وەك وکەرپووچ وبلووك رێژەکەی تەنها ٥,٢٪ بوو.(٢٣)

لەگەڵ ئەوەی ووترا،لەم ساڵانەی دواییدا و لەدەرئەنجامی ئەو گۆڕانـەی بەسـەر ئاسـتی ئابووری جوتیاراندا هات،گۆڕانکاری بەسەر جـۆری کەرسـتەی بیناسـازی هاتـەدی و بەکارهێنانی بلۆك و ئاسن و چیمەنتۆ زیادی کردوو جێگـای کەرەسـتە خۆماڵییـەکانی دێهاتی گرتۆتەوە.




نمونه ی (١)



نمونه ی (١)

نمونه ی (٢)






**شێوەی ژمارە (٨) کەرەستەی بەکارهاتوولەبیناکردنی خانوویکی دێهاتی چەند نموونەیەکی دێ نشینی لە هەرێمی کوردستانی عێراق**

### ١- دێ نشینی لە ناحیەی قوشتەپە[٢٤] :

ئەم ناوچەیە دەکەوێتە ئاراستەی باشووری دەشتی هەولێر ، لە نێوان بازنەی پانی ٣٥,٤٣و٣٦,٠٨باکوور درێژ دەبێتەوە . ڕووبەری دەگاتە نزیکەی ( ١٠٣١ ) کم ٢ کە ڕێژەی ٧,٦ ٪ ی ڕووبەری پارێزگای هەولێردەگرێتەوە کە ( ١٥٤٢٠ ) کم٢.

ناحیەی قوشتەپە بەشێکە لە دەشتی هەولێر،کە بریتیە لە چینێکی قۆپاوی فراوانی نارێك و نیشتەنی گرینی وقورو خۆڵ وبەردپڕی کردووەو دەکەوێتەباکوری خۆرهەلاتی زنجیرەکانی ئاوانە. ڕووی زەوی لەو ناوچەیە لە باشوورو ڕۆژئاوا درێژدەبێتەوە بە ئاراستەی باشووری ڕۆژئاوای ناوچەکە بە شێوەیەك وای کردووە ئەم شوێنانەی نزمترینیان بێت لە ناوچەکە دا. لە ڕووی کەشوهەواوە ناوچەکە دەکەوێتە هەرێمی گەرمەسێر،کە هاوینی ووشك و گەرمە زستانی مام ناوەندی باراناویە. بۆیەش کەشوهەوای کیشوەریە وڕادەی باران بارینی لە نێوان ( ٤٠٠ – ٤٥٠ )ملم لەگەڵ هەڵبەزو دابەزی زۆر لە ساڵێك بۆ ئەوی تر .

- دابەش بوونی ژینگەیی دانیشتوان :

مەبەستمان دابەش بوونی دانیشتوانە لە نێوان ناوچە شارییەکان و دێهاتی یەکاندا جێگای ئاماژە پێ کردنە کە چەندین پێوەر هەیە بۆ جیا کردنەوەی ژینگەی شاری و دێهاتی لەوانە سنووری کارگێری ، ئەو کەسانەی لە ناوسنووری کارگێریەکەنە بە دانیشتوانی شار هەژمار دەکرێن لە کاتێکدا ئەوانەی لە دەرەوەی ئەم سنوورەن ( دێهاتین ) . لە عێراقدا هەموو سەنتەریەکە کارگێریەکان ( ناحیە ) بەشار دائەنرێن لە کاتێکدا لە وولاتانی تر ژینگەی شاری لە دێهاتی بە ڕێگەی قەبارەی دانیشتوانی یەکەکە جیا دەکرێتەوە،سەرباری پێوەری تر .*

لێرەدا هەوڵ ئەدەین بەرەو پێش چوونی پەیوەندی نێوان دێهاتی و شار لە ماوەی نێوان ساڵانی ( ١٩٥٧ – ٢٠٠٢ ) چارەسەر بکەین بەمەبەستی زانینی جۆری دابەشبوون

وجموجۆڵی دێ نشینی و هۆکارە کارتێکردووەکانی هەروەکو لە خشتەی ژمارە ( ١٠ ) دیارە .

خشتەی ژمارە ( ١٠ ) دانیشتوان لە ناحیەی قوشتەپە و پارێزگای هەولێر بەپێی ژینگە ( ١٩٥٧ – ٢٠٠٢ )

| ساڵ | ناحیەی قووشتەپە | | پارێزگای هەولێر | |
|---|---|---|---|---|
| | شارنشین ٪ | دێهاتی ٪ | شارنشین ٪ | دێهاتی ٪ |
| ١٩٥٧ | ١٧ | ٨٣ | ٢٧ | ٧٣ |
| ١٩٦٥ | ٢ | ٩٨ | ٣٨ | ٦٢ |
| ١٩٧٠ | ٢ | ٩٨ | ٣٧ | ٦٣ |
| ١٩٧٧ | ٤ | ٩٦ | ٥٣ | ٤٧ |
| ٢٠٠٢ | ٤٣ | ٥٧ | ٨٢ | ١٨ |

سەرچاوە :

١) الجمهورية العراقية، وزارة الداخلية، مديرة النفوس العامة، المجموعة الإحصائية لتسجيل عام ١٩٥٧، لوائي موصل واربيل، مطبعة الإرشاد، بغداد، جدول رقم٨، ص٢١٧_٢٢٩.

٢) وزارة التخطيط الجهاز المركزي للإحصاء، نتائج التعداد العام للسكان لسنة١٩٦٥، مطبعة الجهاز المركزي،بغداد، جدول رقم /١ ،١٩٧٣،ص ٩_١٠.

٣) وزارة الإصلاح الزراعي، إحصاء القرى وسكان الريف في العراق، من بحوث المؤتمر الأول للإسكان الريفي، بغداد، ١٩٦٥.

٤) وزارة التخطيط الجهاز المركزي للإحصاء، نتائج التعداد العام للسكان لسنة ١٩٧٧، محافظة اربيل ، مطبعة الجهاز المركزي، بغداد، ١٩٧٨، جدول رقم /٤، ص٧,٦.

٥) إقليم كردستان العراق، وزارة الأعمار والتنمية، مديرية التخطيط و التنمية، قسم الإحصاء، بيانات السكان لسنة٢٠٠٢.

لە خشتەکەدا ئەوەمان بۆ دەرئەکەوێت کە رێژەی دێهاتی یەکان لە ناحیەی قووشتەپە بەرز بۆتەوە لە ٨٣ ٪ بۆ ٩٨ ٪ لە نێوان ساڵانی ١٩٥٧ – ١٩٦٥ . لە کاتێکدا ئەم رێژەیە نزم بۆتەوە بۆ دانیشتوانی شارنشین و لە ١٧ ٪ بۆتە ٢ ٪ ئەمەو لە سەر ئاستی پارێزگادا نزمبۆتەوە کە لە ٧٣٪ بووە ٦٢٪بۆ هەمان ساڵ .

له نێوان سالانی ۱۹۷۰ – ۱۹۷۷ گۆڕانێكی بەرچاوو له ڕێژەی دانیشتوانی دێهاتی لـه ناوچەكەدا ڕووی نەداو هەر بەرز بوو . بەڵام ئەم ڕێژانە ڕێرەوێكی تری گرت لـە سـالی ۲۰۰۲ لێرەدا ڕێژەی دانیشتوانی دێهـاتی نـزم بـۆوە بـۆ ٥٧٪ لـە بەرامبـەر دا ڕێـژەی دانیشتوانی شارنشین بـەرز بـۆوە بـۆ ٤٢٪ لـە كاتێكـدا ڕێـژەی پارێزگـا لەدانیـشتوانی شارنشین بەرز بۆوە بۆ ۸۲٪ لەبەرامبەر نزم بوونەوە دانیشتوانی دێهاتی بۆ ۱۸٪ .

نزمبوونەوەی ڕێژەی دانیشتوانی دێهاتی لە كۆی دانیشتوانی دەبێتـە مایـەی سـەرهەلدانی گۆڕانی زۆر ، ئەمەش ڕەنگدانەوەی هەیە بۆسەر ژمارەی نشینگە گوندیەكان و قـەبارەیان لە ناوچەكەدا و دواتر شێوازی دابەش بوونی جوگرافی هەروەكو باسی دەكەین .

- دابەش بوونی چەندێتی ( عددی ) نشینگە دێهاتیەكان :

گۆڕانێكی بەرچاووبەسەر دابەش بوونی دێیەكان لـە ناوچـەكەدا هاتووەتەكایـەوە لـە ساڵە جیاكاندا ، بۆیەش ئەمە بۆتە مایەی گۆڕانی زۆر لە پێشەوەی هەمووشیان ژمـارەی نشینگە دێهاتیەكان . ژمارەی گوند لە ( ۱۰۷ )لە ساڵی ۱۹٥۷ بۆ ( ۱۰٥ ) سـاڵی ۱۹۷۷ كەم بووە. لە ساڵی ۱۹۸۷ بووە تەنها ( ٤ ) گوند.بەڵام ساڵی ۲۰۰۲ بـەرز بۆوە بۆ ( ۷۸ ) گوند .

لە كاتی گۆڕینی ئەم ژمارانە بۆ ڕێـژە ، ڕادەی نـزم بوونـەوەی ژمـارەی گونـدمان بـۆ ئاشكرا دەبێت بە تایبەتی لە حەفتاكان و هەشـتاكانی سـەدەی ڕابـردوو . ڕێـژەی نـزم بوونەوەكە ( – ۰,۱ ) بوو لە ماوەی ( ۱۹٥۷ – ۱۹۷۷ ) وەلە ماوەی دووەمـدا ( ۱۹۷۷ – ۱۹۸۷) سەنتەرەكانی دێهاتی گۆڕانێكی فراوانی بەسەر داهـات لـە ڕووی ژمارەو دابەش بوونی جوگرافی،ڕێژەكەی ( – ۹٦ ) بوو،كەئەمـەش ئـەوە دەگەیـەنێ ( ۱۰۳ ) دێ سڕاوەتەوە لەسـەر نەخـشەی ناوچـەكە .لـە سـاڵی۲۰۰۲ خۆشـبەختانە ژمارەی دێیەكان بەرز بۆوە بە شێوەیەكی بەرچـاوو بۆیـەش ڕێـژەی گـۆڕانی سـالانەی ۱۲۰٪ بوو . ئەم گۆڕانانەش لەسەیر كردنی خشتەی ژمارە ( ۱۱ ) ئاشكرا دەبێت .

**خشتەی ژمارە ( ١١ )**

**ڕێژەی گۆرانی ساڵانەی ژمارەی گوندەکان ( ١٩٥٧ – ٢٠٠٢ )**

| ساڵ | ژمارەی گوند | گۆرانی ساڵانە٪ |
|---|---|---|
| ١٩٥٧ | ١٠٧ | – |
| ١٩٧٧ | ١٠٥ | ٠,١- |
| ١٩٨٧ | ٤ | ٩٦- |
| ٢٠٠٢ | ٧٦ | ١٢٠ |
| ١٩٥٧ – ٢٠٠٢ | --- | ٠,٦- |

**سەرچاوە :**

الجمهورية العراقية وزارة الداخلة مديرية الأحوال المدنية العامة، مديرة الشعبة الفنية، دليل التعداد العام لسنة ١٩٥٧، دار الجمهورية للطباعة، ص١٠٦.

١) مديرية إحصاء محافظة اربيل، نتائج الحصر والترقيم في محافظة اربيل لعام ١٩٧٧، جدول رقم ١، ص٣، ٤.

٢) إقليم كردستان العراق، مديرية الإحصاءفي محافظة اربيل، سجلات الاحصاءالخاصة بتعداد سنة ١٩٨٧.

٤) اقليم كردستان العراق، وزارة الأعمار، شعبة التخطيط، والمتابعة، اعداد القرى لمحافظة اربيل، ٢٠٠٢.

## دابەشبوونی قەبارەیی نشینگە دێهاتییەکان :

مەبەست لە دابەشبوونی قەبارەیی ، ریزبەند کردنی یاخود پۆلێن کردنی گوندەکانە بەپێی سەنگی دانیشتوانی ، بەواتای دابەش بوونی قەبارەی گوندەکان پشت بە ژمارەی دانیشتوانی هەر گوندێك دەبەستێ کەئەمەش جیاوازە لە یەکەیەکی کارگێری بۆ ئەوەی ترو لە گوندێك تا گوندێکی تر لە هەمان یەکە کارگێریەکە.

ئەم جیاوازیانەلە دابەشبوونی قەبارەی دانیشتوانی دێهاتی یەکان ڕەنگدانەوەی جیاوازیە لە ڕێژەی گۆڕانی ژمارەی گوندەکان کەلەمەو پێش ئاماژەی پێکرا . ئەم جیاوازییانەش گرنگی خۆی هەیە لە هەڵبژاردنی هەندێك گوند بەمەبەستی بەرەو پێش بردنی و دامەزراندنی هەندێك پرۆژە بەمەبەستی خزمەت کردنی گوندەکانی دەوروبەری هەروەها بۆ بەرز کردنەوەی پلەی کارگێری پشت بەستن بە پێوەری جیاجیا لەوانەش ژمارەی دانیشتوان .

ژمارەی نشینگە دێهاتییەکانی ناوچەکە لە ساڵی ١٩٧٧ ( ١٠٥ ) گوند بوو، ژمارەی دانیشتوانی ( ٢٧١٧٠ ) کەس بوو ، ناوەندی قەبارەی گوندیش ( ٢٥٨ ) کەس بوو. کەئەمەش بەرزترە لە تێکڕایی پارێزگا بۆ هەمان ساڵ کە ( ٢٤٣ ) کەس بوو لە ساڵی ٢٠٠٢ ژمارەی نشینگەکان گەیشتە ٧٦ و ژمارەی دانیشتوانی ( ٢٢٠٠٠ ) کەس بوو ناوەندی گوندیش ٢٨٩ کەس بوو کەهەربەرزتر بوو لە تێکڕایی پارێزگا کە ٢٤٩ کەس بوو .بۆ ئەوەی وێنەی ڕیزبەندی قەبارەی نشینگە دێهاتی یەکان ئاشکرا بێت دەکرێ دابەشی بکەین بەسەر ئەم بەشانەی خوارەوە :

خشتەی ژمارە (١٢)

ڕیزبەندی قەبارەی نشینگە دێهاتییەکان لە ناحیەی قوشتەپە لە ساڵانی( ١٩٧٧ - ٢٠٠٢ )

| دەستەی قەبارە کەس | ١٩٧٧ | | ٢٠٠٢ | |
|---|---|---|---|---|
| | ژمارەی نشینگە | ٪ | ژمارەی نشینگە | ٪ |
| کەمتر لە ٢٠٠ | ٦١ | ٥٨ | ٥٤ | ٧١ |
| ٢٠٠ - ٥٠٠ | ٢٨ | ٢٧ | ١٨ | ٢٤ |
| ٥٠٠-١٠٠٠ | ١٥ | ١٤ | ٣ | ٤ |
| ١٠٠٠ زیاتر | ١ | ١ | ١ | ١ |
| کۆی گشتی | ١٠٥ | ١٠٠ | ٧٦ | ١٠٠ |

سەرچاوە : ١-مديرية الإحصاء في محافظة اربيل ، نتائج الحصر والترقيم لمحافظة اربيل لعام١٩٧٧، ص٣ ،٤.

٢-نتائج التعداد المشترك لمنظمة الزراعة والاغذية العالمية (F.A.O)ومديرية احصاء اربيل:٢٠٠٢، غير منشورة.

لەسەیر کردنی خشتەی ڕابردوو بۆمان دەردەکەوێت کە جیاوازیەکی گەورە هەیە لە نێوان جۆرە قەبارەیەکان لە ئاستی ناوچەکە . گەر جۆری یەکەم وەربگرین کە ژمارەی دانیشتوانی کەمترە لە ۲۰۰ کەس بۆمان ئاشکرا دەبێت کە ڕێژەکەی ۵۸ ٪ لە سالی ۱۹۷۷ کە نزیك بوو لە تێکرایی پارێزگا بۆهەمان سال کە ٦۳ ٪ بوو . لە سالّی ۲۰۰۲ جۆری یەکەم هەربەبەرزی مایەوە و ڕێژەکەی ۷۱٪ بوو، بۆیەش ئەم جۆرە بنچینەی سەرەکی گوندەکانی ناوچەکە پێك دێنێ و لەوانەشە ژمارەی دانیشتوانی کەمتر بێت لە ( ۱۰۰ ) کەس وەکو گوندی کوپەقران وکەرزۆرکە ۲۰ کەس بوو .سەبارەت بە جۆری دووەم ( ۲۰۰ – ۵۰۰ ) کەس لەسالّی ۱۹۷۷ لە۲۷٪ بوو،کە هاوشێوەی تێکرای پارێزگایەبۆ هەمان سالّ . لە کاتێکدا ڕێژەکەی نزم بووە بۆ ۲٤٪ سالی ۲۰۰۲ جۆری قەبارەی سێیەمیش ( ۵۰۰- ۱۰۰۰) ڕێژەکەی ١٤٪ بوو سالی ۱۹۷۷ کە بەرز تر بوو لە تێکڕایی پارێزگا کە ۸٪ بوو. لە سالّی ۲۰۰۲ دابەزی بۆ ٤٪ ئەوەی تایبەتە بە جۆری کۆتایی کە ژمارەی دانیشتوانی ۱۰۰۰ کەسە ڕێژەکەی لە ( ۱٪ ) زیاتر نەبوو لە تێکڕایی ژمارەیگوندەکانی ناوچەکە بۆ هەردوو سال ۱۹۷۷ – ۲۰۰۲ . کو هاوشێوەی پارێزگایە و لە (۲٪ ) ی زیاتر نەبوو.

- تەرزەکانی دابەش بوونی جوگرافی نشینگە دێهاتیەکان :

چەندین ڕێگا هەیە کە دەتوانرێت پشتی پێ ببەسترێت بۆ زانینی تەرزەکانی دابەش بوونی نشینگەکان وەکو پشت بەستن بە نەخشەکان یاخود تێبینی کردنی ئاراستەی راستەوخۆ یاخود شی کردنەوەی ئامارەکان لێرەدا هەول ئەدەین لە ڕێگا ئاماریەکاندا تەرزەکانی دانیشتوانی جوگرافی دێهاتەکان دیار بکەین .

۱ – چڕی دێ نشینی :

مەبەست ژمارەی نشینگە دێهاتی یەکانە کەلەهەر ۱۰۰ کم [۲] هەیە یاخود ڕێژەی ڕووبەری بەرکەوتوو بۆ هەر نشینگەیەك لە ڕووبەری یەکە کارگێریەکە .خشتەی ( ۱۳ ) چڕی دێ نشینیمان لە ناوچەکەدا بۆ دەرئەخات کەلە سالّی۱۹۷۷ ( ۸,۳ ٪ )

بوو کە بەرزتر بوولە پارێزگـا ( ٧,٢ ٪ ) بـوو بۆهـەمان سـاڵ . لـە کاتێکـدا سـاڵی ٢٠٠٢ ئەم ڕێژەیە نزم بۆووە بۆ ٥,٩ ٪ گوند /کم[٢] کەکەمتر بوو لە ڕێـژەی پارێزگـا کە ٦,٢٪ گوند / کم[٢] بوو کەئەمەش دۆخێکی ناسروشی یە لە ناوچەیەکی دێهاتی کە دەبـوو چـڕی دێهـاتی بـەرزتر بێـت بـەلام ئـەم نـزم بوونەوەیـە ڕەنگدانـەوەی ئـەو گۆڕانکاریانەیە کەبەسەر ناوچەکەدا هاتووە بەتایبەتی لە هەشتاکانی سەدەی رابـردوودا

خشتەی ژمارە (١٣)

چڕی دێ نشینی لە ناحیەی قوشتەپە وپارێزگای هەولێر( ١٩٧٧ – ٢٠٠٢ )

| یەکەی کارگێری | ١٩٧٧ | ٢٠٠٢ |
| --- | --- | --- |
| | گوند / کم٢ | گوند / کم٢ |
| قوشتەپە | ٨,٣ | ٥,٩ |
| پارێزگا | ٧,٢ | ٦,٢ |

٢ – هاوکۆلکەی پەرت بوون :

ئەمەش بەکاردێت بۆدیاری کردنی تەرزەکانی دابەش بـوونی جـوگرافی نـشینگە کـان بەپێی ژمارەی دانیشتوان لە ناوچەی لێکۆلینەوە. خشتەی ( ١٤ ) ئەمەئاشکرادەکات

. خشتەی ژمارە (١٤)

هاوکۆلکەی پەرت بوون لە ناحیەی قوشتەپە و پارێزگا (١٩٧٧ – ٢٠٠٢ )

| یەکەی کارگێری | ١٩٧٧ | ٢٠٠٢ |
| --- | --- | --- |
| قوشتەپە | ١٠١ | ٤٤ |
| پارێزگا | ٤٨٨ | ١٧٣ |

،دا بەدیار ئەکەوێت کە هاوکۆلکەی پەرت بوون لە ناوچەکە( ۱۰۱ ) پلە ی ۱۰۷۷ ، کەزۆر کەمترە لە پارێز گا ٤٨٨ پلە بوو بۆ هەمان ساڵ .لە ساڵی ۲۰۰۲ هاوکۆلکەی پەرت بوون دابەزیە ٤٤ پلە لە ناوچەکەو لە پارێزگاش دابەزییە ۱۷۳ پلە بە پێی دەرئەنجامی هاوکۆلکەی پەرت بوون دەکرێ بلێین کە دابەشبوونی نشینگەکان لە تەرزی پەرت وبڵاوو بووە تەرزی بڵاوە بوو لە ئاستی ناوچەکە.

## هۆکارەکارتێکردووەکانی دێ نشینی لە ناوچەکە

۱ – هۆکاری سرووشتی : –

ناحیەی قووشتەپە بەوە جیا دەکرێتەوە کە زەوی یەکی تەختی پێچاو پێچی هەیە بەرزیەکەی لە نێوان (۲۸۳ – ۸۰۰ ) مەتر دایە لەسەرئاستی رووی دەریاوە لێژییەکەی بەرەو رۆژئاواو باشوورە بە شێوەیەکی گشتی سەرباری لێژیەکی تری لە ناوچەیەکی بچووکی لە باشووری رۆژئاوای بەرەو رۆژهەلات بەشی باکووری رۆژهەلاتی ناوچەکە لەهەر هەمووی بەرز ترەو لە ٦۰۰ مەتر کەمتر نین. زنجیرە ی دێدەوان گرنگترین دیاریدەی بەرزی ونزمیە لێرەدا.

جگە لەمە چەندین دەشت هەیە لە ناوچەکەدا وەکو دەشتی ( قەرە قاچین ) لە نێوان گوندی هەلەجەی بچووك و گوندی بیستانەی گەورە ، دەشتی چادریان لە نێوان سەرمەزارو بیستانەی گەورە . دەشتی خۆرە سۆرك لە نێوان ئۆمەرە سۆرو بیتانەی گەورە دەشتی شینە لە پالانی دەشتی ئەسحابە لە گردمەلا. رووی زەوی ناوچەکە وای کردووە کە دەشتەکان پچڕپچر و لێك دابراو بێت بەمەش رۆلێکی چاکی هەبووە لە دامەزراندنی گوندی بچووك کەمترلە ۲۰۰ کەس بێت کە رێژەکەی ۷۱٪بوو هەروەکو لەمەو پێش ئاشکرا بوو یارمەتی پەیدا بوونی تەرزی بلاوە بوو کە هاوکۆلکەی پەرت بوون ٤۰ پلە بوو .

جگە لەمانەی ڕووی زەوی ناوچەکەوای کردووە کە هالوشێوە بێت لـە ڕووی بـڕی بارانی کەوتوو ڕادەی سەرچاوەکانی ئاوە.بـڕی بـاران لـە ناوچـەکە ٤٠٤ملـم بـەڵام هەڵبەزین و دابەزینی زۆرە نموونەش ساڵی ١٩٩٣ بڕی ٧٥٢ملم باریوە لـە کاتێکـدا زیاتر نەبوو لە ١٧٠ ملم ساڵی ١٩٩٩. دووبارە بوونەوەی ووشکە ساڵی کاریگەری ئاشـکرای جـێ هێـشتووە بەسـەر بەرهـەمی کـشتوکاڵی لـە ناوچـەکەدا بـە تایبـەتی بەرهەهێنانی دانەوێلە،کە پشت بە ئـاوی بـاران دەبەسـتێ جگـە لەمـەش ئـەم حالـەتە کاریگەری بەسـەر ووشـك بوونـەوەی خـاك بـووە وایکـردووە خۆلەکـەی بەیەکـەوە بەستراو بێت و بەرەنگار بوونەوەی ڕامالین نەبێت کەئەمەش ڕووبەرە بـە بیابـان بـوون فراوانتر دەکات . سەبارەت بە ئاوی ژێر زەوی ئـەوا ڕادەی ئـاوی لـە سـالێکەوە بـۆ سالێکی تر دەگۆڕێ بە پێی بـڕی بـاران ، هـەروەها لـە بیرێکـەوە بـۆ بیرێکـی لەبـەر جیاوازی قووڵی و پێکهاتەی بەردی ناوچەکە. ئامارەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە بیر لـە ٦٨ گونـد هەیـە کەلـە ٨٧٪ی کـۆی گـشتی گونـدەکان دەگرێتـەوە.خەسـلەتە سروشتییەکانی ڕابردوو کە باسکرا بە تایبەتی ئەوەی پەیوەستە بە ڕادەی باران و ڕێژەی ئاوی ژێر زەوی ڕەنگدانەوەی هەبووە نەك تەنها بەسەر تـەرزو دابـەش بـوونی نـشینگە دێهاتی یەکان بەلکو بەسەر قەبارەو ژمارەی نشینگەکانیش .

٢– هۆکاری مرۆیی :

ئەمەش خۆی لە فاکتەرە ئابووری و کۆمەلایەتی و رامیارییـەکان دەبینێتـەوە فاکتـەرە ئابوورییەکان کە بریتیە لە شـێوازەکانی بەرهـەم ووەدەسـت هێنـانی بەگەڕخـستنی لـە پێشەنگی هۆکارە مرۆییەکان دێت کە کاریگـەرە بەسـەر تـەرزی نیـشتەجێ بـوون لـە ناوچەکەدا. دانیشتوان پشت بە چالاکی کشتوکاڵی دەبەستن و لە خشتەی ( ) ئاشنای سروشتی چالاکی کشتوکاڵی دەبین لـە ناوچـەکە . لـە خـشتەکەدا تێبینـی دەکـەین کشتوکاڵی زستانە ،کە پشت بەباران دەبەستێ زیاتر لە ٥/٤ ی ڕووبـەری چـاندراوی سالانە پێك دێنێ.کە بریتیە لە چاندنی گەنم و جۆ کە ڕادەی بەرهەم هێنان دەگۆڕێ لە

ساڵێکەوە بۆئەوی تر لەبەر جیاوازی باران بارین . پشت بەستن بەم جۆرە شێوازە لە ئاودێری وایکردووە تەرزی نیشتە جێ بوون بڵاوە بوو بێت و کەشتیار لێرەدا پێویستی بە فراوانترین رووبەر هەیە بۆ چاندنی، جگە لەوەی کە سەر نەکەوتنی بەرهەم مەترسیەکە بۆی گەر بارانی پێویست نەباریٰ بۆیەش قەبارەی گوندی بچووکە .

سەبارەت بەبەرهەمی هاوینە ئەوا سەوزەوات بەپلەی یەکەم دێت کە رێژەکەی ٨٧٪ ی کشتوکاڵی هاوینە داگیر دەکات و بەروبوومی تەماتە لە پێشەنگی هەموویان دێت بە رێژەی ٦٠٪ . ئەمانەش نیشانەی کەمی بەرهەم هێنانی هاوینەن لە ناوچەکە کە بۆ کەمی ئاو دەگەرێتەوە . بۆ نموونە گەنمە شامی وگوڵە بەرۆژەو کونجی کە لە بەرهەمی هاوینەی گرنگن وداهاتی باشە،هەموویان تێکرا زیاتر نیە لە ١٣٪ ی بەرهەمی هاوینە .سەبارەت بە لایەنی کۆمەلایەتیش،ئەوا گرنگی تایبەتی هەیە لەلایەن پێویست بوونی ژیانی بە کۆمەڵ کە بواری خانووی تاك نادات و لەبەر هەبوونی دەشتی لەبار لێرەدا چڕ بوونەوە سیفەتێکی دیارە سەبارەت بە هۆزێکی دیاریکراوو لە کاتێکدا ئەم دیاریدەیە لاوازە لە ناوچە شاخاویەکان. هۆکاری ئاینی رۆلێکی چاکی هەیە لە دامەزراندن و بەردەوام بوونی ژیانی گوندەکە چونکە بوونی گۆرێکی پیاو چاکێك دەبێتە مایەی کۆبوونەوەی خەڵکی لەویٰ ، نموونەش گوندی ( پیرداوود ) کە گۆری پیاو چاکێکی تێدایە هەروەها گوندی گردمەلا و گوندی گرەشێخان ..هی تر . ئەوەی پەیوەندارە بە فاکتەری رامیاریش ئەوا رۆلێکی یەکجار گەورەی هەبووە لە دابەشبوونی نشینگەکان بە تایبەتی لە چارەگی کۆتایی سەدەی رابردوو لە ساڵی ١٩٦٨ و بەدواوە بە تاڵ کردنی دێهاتی کوردستان لە دانیشتوانی بە هەمووشێوازێك زۆر ئاشکرا بوو . هەڵمەتەکانی ئەنفالیش ساڵی ١٩٨٨ کۆتایی بوو سەبارەت بە نەهێشتنی دێهاتی کوردی . نموونە،ناوچەکە لە پێش ساڵی ١٩٨٧ سەدوو پێنج گوندی تێدا بوو لە کاتێکدا لەو ساڵەتەنها چوار کۆمەڵگای تێداما کە ( قودس ، قادسیە ، کەورگۆسك ،مزووری) بوو ئەمە جگە لە هەڵوەشاندنەوەی لەلایەنی کارگێری و لکاندنی بە

سەنتەری قەزای هەولێر . بەلاَم خۆشبەختانە لـە دوای ڕاپـەڕینی سـالَی ١٩٩١ بـارو دۆخەکە گۆڕاو بوار بۆ گەڕانەوەی دانیشتوانی دێهاتی درا بۆ گوندەکانیان و لـە سـالَی ١٩٩٣ ناحیەکە سەری هەلَداوە .

خشتەی ژمارە (١٥) ڕووبەری چاندراوو جۆری بەرهەم لە ناحیەی قوشتەپە ٢٠٠٢

| المحاصيل | المساحه /دونم | المحاصيل | المساحه /دونم | المحاصيل | المساحه /دونم | المحاصيل | المساحه /دونم |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| القمح | ١٤١٠٠٠ | الگماگه | ٤٩٦٠ | الفجل | ٣٠٠ | رقی | ٧٥٣ |
| الشعير | ١٣٠٠٠٠ | الخيار | ٢٨٠ | السلق | ٤٠٠ | بگيخ | ١٢٠ |
| الباقلاو | ٤٥٠ | الباذنجان | ٨٣٠ | الشلغم | ٧٥ | زهره الشمس | ٥٠٠ |
| البصل | ٤٧٠ | الشجر | ٨٦٥ | اللهانه | ٧٥٠ | الفلفل | ١٥٠ |
| العدس | ٢٠٠ | الباميا | ١٧٠ | الجزر | ٦٥ | السمسم | ٣٥١ |
| الحمص | ٢٠٠ | اللوبيا | ٢٢٤ | الخس | ١٠٠ | الذره | ٣٥٥ |

سەرچاوە:

وزارة الزراعـة والری،المديريـة العامـة لزراعـة اربيـل،فرع قوشتةثة،قـسم التخطيط،خطـة الانتـاج الزراعی،٢٠٠٢.

## ٢- تەرزەکانی دابەش بوونی شوێنگەیی سەنتەرەکانی دێ نشینی لە قەزای شەقلاوە [٢٥]:

**پێشەکی**

قەزای شەقلاوە نزیکەی ١٧٨٧کم ٢ داگیر دەکات لە پارێزگای هەولێر بە ڕێژەی ١٢,٣٪ . ژمارەی دانیشتوانی دێهاتی گەیشتە (٤٥٩٩٤ ) کەس،لە ساڵی ٢٠٠٢کە ڕێژەکەی ١٩,٤٪ کۆی گشتی دانیشتوانی دێهاتی لە پارێزگای هەولێرگرتەوە کە ژمارەیان ( ٢٣٧٥٧٥) کەسە. نەخشەی ( ١ ) شوێنی قەزاکە دیار دەخات لە پارێزگای هەولێر .

نەخشەی ژمارە (1) پێگەی ناوچەی لێکۆڵینەوە لە پارێزگای هەولێر

**بەکارهێنانی هاوکێشەی دراوسێی نزیکتر ( الجار الاقرب) بۆ دەرخستنی تەرزەکانی دابەش بوون لە ناوچەکەدا:**

هەوڵ ئەدەین لێرەدا هاوکێشەی دراوسێی نزیکتر بەکاربهێنین وەکو شێوازێکی ئاماری بۆ شیکردنەوەی تەرزەکانی دێ نشینی لە قەزای شەقلاوە،پشت بەست بەو داتایانەی کە کۆکراونەتەوە لە نەخشەی ( ۲ ) توانرا خشتەی ( ۲ ) لی پەیدا بکەین،کە دووری پێشبینی کراوو ڕاستەقینە دەردەخات لە نێوان هەر خاڵێك و نزیکترین دراوسێی لە ناوچەکە.هاوکێشەکەش بەم شێوەیە پراکتیك کرا :

۱- سەنتەرەری هەر گوندێك دیاریکرا لەگەڵ نزیکترین دراوسێی لە نەخشەی ( ۲). دواتر دووری نێوانیان هەژمار کراووتێکڕایی دووری ڕاستەقینە دەرخران کە ۰,۵۳ بوولەناوچەکەدا.

۲- بەهای دووری پێشبینی کراوو دەردەهێنرێ بەپێ ی :

de = ۱ / √ p

de: پێشبینیکراو

P: چڕی دێ نشینی کەبەم شێوەیە دەردەهێنری: چڕی دێ نشینی = ژمارەی نشینگەکان / رووبەری ناوچەکە

ئەنجامەکەی ۲,۸۷ بوو .

۳- دواتر دووری ڕاستەقینە دابەشی پێشبینی کراووی دەکەین بۆ دەرخستنی بەهای دراوسێی نزیکتر کە ۰,۱۸ بوو. لە سەیرکردنی خشتەی (۱٦)دەتوانین تەرزی دابەشبوون ئاشکرا بکەین لە ناوچەکەدا.

## خشتەی ژمارە (١٦)

## بەهاووتەرزی دابەشبوون بەپێی هاوکۆلکەی دراوسێی نزیکتر

| بەهای هاوکۆلکەی ئاماری(Rn) | تەرزی دابەشبوون |
|---|---|
| ٠,٠٩ –٠,٠٠ | کۆەبوو |
| ٠,٤٩ –٠,١٠ | نزیکی عەنقودی |
| ٠,٩٩ –٠,٥٠ | نزیکی هەرەمەکی |
| ١,١٩ –١,٠٠ | هەرەمەکی |
| ٢,١٥ –١,٢٠ | لێك دوور |

سەرچاوە: نعمان شحاذة ،الأساليب الكمية في الجغرافية باستخدام الحاسب ،دار الصفاء ،عمان ،ط٢ ،٢٠٠٢،ص ٢٠٦.

ئەم ئەنجامەش ئەوەمان بۆ دەرئەخات کە سەنتەرەکانی دێ نشینی لە قەزاکە لەڕووی دابەشبوونی شوێنگەیی تەرزی نزیکبوی عەنقودی (متقارب عنقودي ) نیشان دەدات . کە خەسڵەتی لاوەکی تری هەیەو و لە نەخشەکەدا بەدیار دەکەوێ کە گوندی زۆر نزیك لەیەکی تێدایەو لە هەندێك شوێنیش لێك دوورن و هەندێك شوێنی نەخشەکە بەبەتاڵی ماوەتەوە .

## خشتەی ژمارە(١٧)

## تێکرای دووری پێشبینی کراوو ڕاستەقینە لە نێوان هەرخاڵێك و نزیکترین دراوسێی لە قەزای شەقلاوە

| ناحیە | رووبەرکم²* | ژمارەی نشینگەر(n)** | کۆی دووری(Ed) | تێکرای دووری راستەقینە(do) | تێکرای دووری پێشبینیکراو(de) | بەهای هاوکێشەکەی ئاماری(Rn) | تەرزی دابەشبوون |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ن.قەزا | ٣٨٠ | ٤١ | ٢٠.١ | ٠.٤٩ | ٣.٣ | ٠.١٥ | نزیکبووی عەنقودی |
| هەریر | ٦١١ | ٨٩ | ٤٥.٨ | ٠.٥ | ٢.٦٢ | ٠.٢٥ | نزیکبووی عەنقودی |
| سەلاحەددین | ٧٩٦ | ٨٦ | ٤٩.٩ | ٠.٥٦ | ٣.١ | ٠.١٨ | نزیکبووی عەنقودی |
| کۆ | ١٧٨٧ | ٢١٦ | ١١٣.٩ | ٠.٥٣ | ٢.٨٧ | ٠.١٨ | نزیکبووی عەنقودی |

سەرچاوە:

*-وزارة التخطيط، المجموعة الإحصائية السنوية، توزيع الوحدات الإدارية ومساحاتها، بغداد،١٩٨٧، ص١٠-٢٨.

**- مركز المعلومات الإنسانية المشتركة (JHIC) ،معلومات عن محافظة اربيل ، اربيل،٢٠٠٤،ص١٢-١٣.

### – دۆخەکانی دراوسێیەتی :

### ١ – دۆخی دراوسێی تاك :

لێرەدا گوندەکان بە شێوەیەکی هێڵی ڕاستەوخۆ دراوسێ دەبن، گوندی یەکەم لەگەڵ دووەمدا هی دووەمیش لەگەل سێیەمدا ..هتد. ئەمەش بەدرێژایی ڕێڕەوی ڕووبار و دۆڵەکانی شاخاوی دیاری ئەکەوێ .

شێوەی ژمارە (٩) دۆخی دراوسێی تاك



**٢- دۆخی دراوسێی دووانەی بەرامبەر :**

ئەمەیان لەپاڵ ڕێگاکان و دۆلی ڕووبارەکاندا بـەدی دەکـرێ کەلــە دەرئـەنجامی بـوونی دووخالی دووانە دەبێ ئەوەی یەکەم دراوسێی دووەمە هی دووەمیش دراوسـێی یەکەمـە و دووری نێوانیان کەمتر دەبێ لە (١ کم ).

**شێوەی ژمارە (١٠) دۆخی دراوسێی دووانەی بەرامبەر**




**٣- دۆخی دراوسێی دووانەی دوورلەیەك :**

لێرەهەرچەندە هەردووخاڵەکە دوورن لەیەکتری بلام لەگەل ئەوەشدا دراوسێن کەلە زۆربەی شوێنەکانی ناوچەکە بەدی دەکرێ .

**شێوەی ژمارە (١١) دۆخی دراوسێی دووانەی دوورلەیەك**



٤ – دۆخی دراوسێی هەمەلایەن :

لێرەدا هەردووخاڵ وزیاتریشی دەبێتە دراوسێی خاڵێکی دیاری کراو وەکو لە شێوەی خوارەوە دیارە .

شێوەی ژمارە (١٢) دۆخی دراوسێی هەمەلایەن

## هۆکاری کارتێکردووبەسەر تەرزەکانی دابەش بوون

### ١– فاکتەرە سروشتییەکان:

ئەم فاکتەرە کاریگەری هەیە بەسەر تەرزی دابەش بوونی شوێنگەی نشینگەکانی لە ڕێگەی سروشتی بەرزی و نزمی ڕووی زەوی و سەرچاوەکانی ئاو .

لە ناوچەکەماندا بەرزی و نزمی هەمە چەشنی تێدا بەدی دەکەین ،چیاکان کە بەرزیان لە نێوان ١٠٠٠ – کەمتر لە ٢٠٠٠ مەتر دایە ڕووبەرێکی چاکی ناوچەکە داگیر دەکەن وەکو زنجیرە چیای سەفین ( ١٤٧٥م ) کە درێژترینیانە ، چیای میراوە ١١٢١م ، کاموسك ١٥٧١م ، شکرۆك ١٨٤١ م ، مزگەوتە ١١٨٨م ، پیرەم ١٤٢٦ م ، باباجیجك ١٠١٠ م ،هەریر١٥٤٤م، سپیلك ١٤٣٧م ، دیاریدەی تری بەرزی ونزمی لە ناوچەکە دۆڵەکانە ، کە ژمارەیەکی باشی تێدایە وەکو دۆڵی بالیسان،

شەقلاوە ، مزگەوتە ، بەستۆرە ، ئاژگە . هەروەها گردیشی تێدایە لە هەندێك شوێنی ناوچەكە وەكو گردی خەلیلۆك ، بیرك ، سۆڤی جافر ، هیلانە ،بردەكش،رووتار،عملر ئاغا،كردەشێر .

سەبارەت بە دەشتیش ئەوا لە ناوچەكەدا یەكێك لە گرنگترین دەشتەكانی ناوچەی شاخاوی تێدایە كە دەشتی ( هەریرە ) رووبەرەكەی ٤٠٨ كم ٢ كۆمەلێك دۆلی تێدایە كە ەئاوی ناوچەكەی پێدا دەڕوات وەكو ماوەران ، بەربەیان.

پێدەشتی چیاكان و دۆلەكانی و پێشەنگی چیاكان لەبارترین شوێنن بۆ دامەزراندنی دێ لە كوردستانی عێراق بەبەراوورد لەگەل شوێنەكانی تری دۆلەكانی نێوان چیاكانیش شوێنی پەسندی دانیشتوانی ناوچەكە شاخاوییەكانە بۆ نیشتەجێ بوونیان كەئەمەش ڕەنگدانەوەی شێوازی نزیكەوە بووی دێهاتەكانیەتی كەلەگەل ڕێڕەوی دۆلەكانی ناوچەكەدا دەڕوان.بڕوانە وێنەی ( ١١ ).

وێنەی ژمارە ( ١١ )بەشێك لە گوندی گەرووتە-ناوەندی قەزا



جیاوازی ڕووی زەوی ناوچەكە یارمەتی دەربوو بۆ بنیاتنانی گوند بەتایبەتی لە ناحیەی هەریر كە زۆرترین ژمارەی گوند لە خۆدەگرێ لەناوچەكەدا بە رێژەی ٤٣٪

ی نشینگە کان لێرەدا نزیك دەبنەوە لەیەکتری لە کاتێکدا چیاکان نزیك لەیەك دەبن ، وەکو چیاکانی پیرمام ،سەفین ، مزگەوتە کە هەندێك گوند لە نێوان دۆلەکانیاندا سەری هەلداوە وەکو حوجران ، ساکە کواشیر ، کانی سپیلك ، دۆلی کۆڕێ کەگوندێکی بەهەمان ناوی تێدایە. دۆلی بەستۆڕە بەوەجیا دەکرێتەوە کە مۆرکێکی دەشتی هەیەو بەرزی لە نێوان ٤٢٠ – ٥٥٠ مەتر دایە و ٣٥ گوندلە خۆدەگرێ .

سەبارەت بەسەرچاوەکانی ئاویش ئەوایەکێکە لەو فاکتەرە گرنگانەی کاریان کردووتە سەر تەرزەکانی دێ نشینی چونکە ڕادەی ئاوو ڕووبەری گوندەکە دیاردەخات و هەروەها ژمارەشیان ، چونکە هەرچەندە کانیاوو سەرچەشمە زۆر بوون گوندی زیاتر دەبێت ومەودای نێوانیان نزیکتر دەبێت.

زۆربەی نشینگەکانی ناوچەکە لە ڕووخی ڕووبارەکاندا بلاووە دەبن لەو ناوچانەش کە دوورن لە ڕووبار شوێنی نشینگەکانی کاریگەر دەبن بە کانیاوەکان کەلە جوگرافیا پێی دەگوترێت شوێنە پەلّ وشێدارەکان.

ئەمە لە کاتێکدا زۆربەی ڕووبارەکانی ناوچەکە پشت بە کانیاو سەرچەشمە دەبەستێت . لە لێکۆلینەوە یەکدا وا دەرکەوت کەلە کۆی ١٧٦ گوند کە هەژمارکران ١٤٠ گوند کانیاوی تێدابوو بەواتای ڕێژەی ٧٩,٣٪. کە ئاوی ئەم کانیاوانەش بۆ کشتوکالّ و شوانکاری وبەکارهێنانە خێزانیەکان بەکار دێن .

٢ – فاکتەرە مرۆییەکان :

شتێکی سرووشتیە کەپچرپچری زەوی و دەشتەکان و بچووکی ڕووبەریان و پشت بەستنیان بە ئاوی کانیاووسەرچەشمەکان وباران، ببێتە مایەی پەیدا بوونی نشینگەی بچووکی نزیك یەکتر لە ناوچەکەدا . ڕێژەی نشینگە بچووکەکانیش ( کەمتر لە ٢٠٠ کەس ) لە ٦٥٪ ی کۆی نشینگەکانی ناوچەکەی پێك هێناوە.

ئاشکراشە کە دێ نشینی تەنها ڕەنگدانەوەی پەیوەندی نێوان مرۆڤ وژینگەکەی نیە ، بەلکو داب و نەریتی کۆمەلایەتیش کاریگەری هەیە. هەرچەندەش مرۆڤ بەرەو پێش

چوو لەلایەنی شارستانی فاکتەری کۆمەڵایەتی لاوازتر دەبێت. فاکتەرە کۆمەڵایەتیەکان بەوە دیار دەکەوێ کە پێویستی بوونی ژیانە لە نێو کۆمەڵدا، کە لێرەدا نیشتەجێبوونی تاك پەسەند نابێت. بەڵام لەهەمان کاتیشدا پچڕپچڕی زەوی و دژواری لە ناوچەکەدا رۆڵی هەبووە لەپەیدا کردنی جۆرێکی دابڕان لە دێ نشینی کەئەوەی زیاتریشی دەکات هەبوونی ویستێکی ناوچەگەریەتی لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکاندا. هەروەها پێویستی بوون بۆ پاراستن و ڕووبەڕووبوونەوەی کەئەمانەش دەبێتە مایەی پەیدا بوونی تەرزی نزیکەوەبووی دێ نشینی .

لێرەدا رووبەری زەوی کشتوکاڵیش توانای بژێوی کردنی ژمارەیەکی زۆرتری دانیشتوانی نییە بۆیەش هەندێك لە دانیشتوانی گوندەکە ناچارن جوجۆڵ بکەنە شوێنی تر کە زۆر دوور نیە لە گوندەکەیان و لەوانەشە هەمان ناوی هەڵگرتێ لەگەڵ زیادکردنی ووشەی ( سەروو – خواروو ) یا ( بچووك – گەورە ) نموونەش لە ناوچەکەدا زۆرە وەکو ( قەلاسنجی سەروو _ قەلاسنجی خواروو ) یان ( ئەرماوانی گەورە – ئەرماوانی بچووك ) لەوانەشە ئەم جیا بوونەوەیە لە گوندی ڕەسەن لەبەر هۆکاری ناخۆشی بێت لە نێوانیان کە دەبێتە مایەی دەرچوونی کۆمەڵێك دانیشتوانی و دۆزینەوەی شوێنی تر .

**- دێ نشینی لەناحیەی بازیان[٢٦]:**

**ڕوبەری ئەو ناوچەیە (١٧٦) کیلومەتری دووجایە وریژی ١,٥٪ ڕوبەری پاریزگای سلێمانی دەگریتەوە . ئەنجامەکانی سەرژمێری ساڵی (١٩٧٧) ئاماژەی بەوە کردووە کەتێکرای چڕی دانیشتوانی گەیشتە ٣٢،١ کەس/ کم٢، لەکاتێکدا هی پاریزگای سلێمانی ٢٢،١ کەس/ کم٢ بووە.ئەمەو ناوچەکە سەر بەقەزای سلێمانییە لە ڕووی کارگێڕیەوە .**

**نەخشەی ژمارە (٣)**

**شوێنی ناحیەکە دیار دەخات لە پاریزگای سلێمانی**



## گەشەکردنی دانیشتوان لەناحیەی بازیان :-

سەرژمێری ساڵی ١٩٤٧ – ١٩٧٧، سروشتی دێهاتی دانیشتوانی ناوچەکە بەدەردەخەن ، چونکە هیچ سەنتەریکی شاری تێدا هەڵنەکەوتووەو بەمەبەستی دیاریکردنی خەسلەتەکانی دانیشتوانی ئەم ناو چەیە دەکری پشت بەخشتەی ژمارە (١٨) ببەستین کەتیایدا دەرکەوتووە :-

١- ڕێژەی دانیشتوان ناوچەکە لە کۆی دانیشتوانی پاریزگا ١،٩٪ بوو ساڵی ١٩٤٧، بەم شێوەش بەردەوام بوو تاساڵی ١٩٧٧ کە ١،٨٪ بوو.

٢- زیاد بوونی گشتی دانیشتوانی ناوچەکە لەنێوان ساڵانی ١٩٤٧ – ١٩٧٧ بە ئاراستەیەکی پۆزەتیفانە ڕۆیشتووە.بۆ نمونە زیادبوونیکی دانیشتوان ڕوویدا لەنێوان ساڵانی ١٩٤٧ – ١٩٧٧ کە (٨٢٢٣) کەس بووڕێژەی ١،٨٪ کۆی زیادەی پارێزگای گرتەوە کە (٤٦٤١٥٧)کەس بوو.

### خشتەی ژمارە (١٨ )

### ژمارەی گوندو دانیشتوان لە ناحیەی بازیان و پارێزگای سلێمانی

| ساڵ | ناحیەی بازیان | | | | پارێزگای سلێمانی | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | گوندەکان | دێهاتی | شارنشین | کۆ | گوندەکان | دێهاتی | شارنشین | کۆ |
| ١٩٤٧ | ٣٦ | ٤٢٠٠ | --- | ٤٢٠٠ | ٨٤٤ | ١٧٠٣٣٥ | ٥٦٠٥٦ | ٢٢٦٤٠٠ |
| ١٩٥٧ | ٤١ | ٥٤٧٩ | --- | ٥٤٧٩ | ١٤٠٦ | ٢٢٥٢٦٠ | ٧٩٦٣٥ | ٣٠٤٨٩٥ |
| ١٩٦٥ | ٤١ | ٨٢٨٧ | ١٦٠ | ٨٤٨٨ | --- | ٢٧٢٠٣٦ | ١٢٧٧٣٢ | ٣٩٩٧٦٨ |
| ١٩٧٠ | ٥٣ | ٩٠٤٩ | ٢٨٨ | ٩٣٣٧ | ١٤٦٣ | ٢٨٣٦٩٩ | ١٧٤٩٢٨ | ٤٥٨٦٢٧ |
| ١٩٧٧ | ٥٨ | ١٢٠٦١ | ٣٨٢ | ١٢٤٤٣ | ١٨٧٧ | ٣٦٤٩٥٥ | ٣٢٥٦٠٢ | ٦٩٠٥٥٧ |

سەرچاوە/

- وزارة الداخلية،مديرية النفوس العامة،سجلات تعداد السكان لعام١٩٤٧،لواء السليمانية/مجلد ٣،ص ١٥٩.وزارة الشؤن الاجتماعية،مديرية النفوس العامة، سجلات تعداد السكان لعام١٩٥٧،لواء السليمانية.
- وزارة التخطيط،كتاب التعداد السكاني ١٩٦٥.
- خلاصة الحصرالاول للسكان لعام ١٩٧٠ ،ص ٧.
- سجلات تعداد السكان لعام ١٩٧٧،الجداول الاساسية،رقم ٢.

٣- لەکاتی هەژمارکردنی زیاد بوونی دانیشتوان وەکو تێکرای ساڵانە،ئەوا یەکسانە بە (٢٧٥) کەس وگەر ئەم تێکرایەش وەکو ڕێژەی گۆڕاوی ساڵانە هەژمار بکرێ دەگاتە ٣,٧٪ کەس کە زیاترە لە ڕێژەی گۆڕانی پارێزگا ،کە ٢,٦٪ بوو. دابەش بوونی شوێنی نشینگە گوندیەکان :-

سەرژمێری ساڵی (١٩٧٧) ئەوەی دەرخستووە کە (٥٨) نشینگە هەیە لەم ناوچەیە و لەکاتی دابەشکردنی بەسەر ڕووبەری یەك (کیلومەتری دووجا )وجارانی سەددی بکەین ئەوا چڕی دێ نشینی بەدەردەخات کە( ١,٥ ٪) گوند/کم٢بووە،بەواتایەکی تر هەر گوندێك (٣) کم٢ بەبەردەکەوێ .لەکاتی بەراوردکردنی ئەم ڕێژانە بەپارێزگا،کە ١١٪ گوند/ کم٢ بووە ، یاخود (٨,٩) کم٢ بۆ هەر گوندێك ، ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەبێت کە ئەو ناوچەیە چڕی دێ نشینی بەرزەوئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە خەسلەتە جوگرافیەکانی ( سروشتی و مرۆیی ) بەشێوەکی پۆزەتیفانە کاریان کردووە بۆ بەرز کردنی چڕی دێ نشینی .

سەبارەت بە دابەش بوونی شوێنی گوندەکان نەخشەی ژمارە (٤) هەندێك خەسلەتی گشتی دابەشبوون ئاشکرادەکات.گوندەکانی پەرتوبڵاو بوونەتەوە بەسەر هەموو ڕووبەرەکەی بەشێوەیەکی ڕێکوپێك بەبێ ئەوەی لەلایەك کۆببێتەوە جگەلەلایەکی تر.ئەمەش ڕاستی دابەش بوونی چاڵاکی فاکتەرەکانی ڕاکێشانی جێنیشینی دەردەخات لەلایەنی سروشتی وەکو خەسڵەتەکانی ڕووی زەوی و سەرچاوەکانی ئاوو خاك و فاکتەرەمرۆیەکان.کەلەوانەیە لایەنی ئابووری لە پێشەنگیان بێت.تێبینیکردنی نەخشەی ژمارە (٥) و (٦) وبەراورد کردنیان لەگەڵ نەخشەی ژمارە (٤) پەیوەندی شوێنی پێگەی گوندەکان بەدەردەخات چونکە ئاشکرایە کە مرۆڤ چاکترین جێگە (Site) هەڵدەبژێرێت بۆنیشتە جێبوون.لە نەخشەکانیش وا دەردەکەوێ کە چاکترین پێگە لەم ناوچەیە پێشەنگی چیاکانە(مقدمات الجبال) کە بەکەمی لێژی دەناسرێ ؛نزیکە لە دۆڵ ودەشت.بە شێوەیە ئەم ناوچانە خاکی بە پیت وشێدارە،نزیکە لە کانی وکانیاوەکان

م شوێنانه دەردەکەوێ لەبەر هۆکاری جیمۆرفۆلۆجی.ئەوانەی باسکران هەمووی
نی سەرەکین و پێویستن بۆچالاکی کشتوکاڵی کەچالاکی سەرەکی دانیشتوانی
دیهاته .

نەخشەی ژمارە( ٤ ) دابەشبوونی گوندەکان



نەخشەی ژمارە(٥ )
رووی زەوی





نەخشەی ژمارە( ٦ ) سەرچاوەکانی ئاوو

دابەشبوونی قەبارەی نیشینگە دیهاتیەکان :-

بەمەبەستی زانینی ڕیزبەندی قەبارەیی نشینگە گوندیەکانی ناحیەکە ئەو پێـــــــــــــوەرانەمان وەر گرتووە:-

-کەمتر لە (٥٠٠)کەس (گوندی بچووك )

- (٥٠٠ – ١٠٠٠) کەس (گوندی ناوەندی )

- (١٠٠٠ ) کەس زیاتر (گوندی گەورە )

لە ڕۆشنایی ئەم پێوەرانە دەرکەوتووە کە ناحیەکە بەوە دەناسرێ گوندی بچوکی زۆرە.لە خشتەی ژمارە (١٩) دەردەکەوێ کە (٩٥٪)گوندەکانی ناحیەکە دانیشتوانی کەمترە لە (٥٠٠) کەس.بەڵکو هەندێك نشینگە ژمارەی دانیشتوانی (٩ ) کەس و (٢٧) کەس و (٣١) کەسە لەم گوندانە "کانی شیتان" و "اللەقولی" و "شێخ خدر" و "سەرچاوە"،خانوەکانیش لەنێوان (٢ – ١٢ ) خانوەوئەوگوندەش کەلە(١٠٠٠ ) کەس زیاترە گوندی" باریکە" بوولەناوچەی خۆرئاوای لەسەر ڕووبەرێکی پان و بەرین و کۆمەڵە گوندێکی بچووك دەوری داوە و دیارە ئەو گوندەش پیشەیەکی خزمەتگوزاری هەیە کە پێشکەشی ناوچەکانی خۆرئاوای ناحیە دەکات لەکاتێکدا ناوچەکانی خۆرئاوا پشت بە سەنتەری ناحیەکە دەبەستن کە دەکەوێتە سەر ڕێگای ( سلێمانی – کەرکوك ) .

## خشتەی ژمارە (١٩)

## ڕێزبەندی قەبارەیی نشینگە گوندیەکانی ناحیەی بازیان وپارێزگای سلێمانی

| ڕێزبەند | بازیان | پارێزگا |
|---|---|---|
| کەمتر لە ٢٠٠کەس | ٣٥ | ١٢٤١ |
| ٢٠٠-٤٩٩ کەس | ٢٠ | ٤٨٩ |
| ٥٠٠-٩٩٩ کەس | ٢ | ٩٦ |
| ١٠٠٠-١٩٩٩ کەس | ١ | ٢٦ |
| ٢٠٠٠ زیاتر | --- | ١ |
| کۆ | ٥٨ | ١٨٥٣ |

سەرچاوە/

نتائج التعداد العام للسكان ١٩٧٧،جداول ٣،سجلات اساسية غير منشورة.

**تەرزی نیشتەجێ بوون و هۆکارە کارلێکردووەکانی :-**

جوگرافیزانەکان دێنشینی بەسێ تەرز دیاری دەکەن کە : بلاوەبوو جەنجاڵ و پەرتوبلاوە.لەناوچەی بازیانیش نشینگەکان وەکو لەنەخشەی ژمارە (٤) دیارە ،تەرزی یەکەمیان وەر گرتووە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەکرێ تێبینی ئەو ناوچانەی خوارەوەش بکرێ :-

- ناوچەیەکی کۆبوونەوەی سەرەکی لەباشور بەتایبەتی باشوری خۆرهەلات.
- ناوچەیەکی کۆبوونەوەی لاوەکی لەو پەڕی باکوری ناوچەکە .
- ناوچەیەکی کەم گوند لەبەشی ناوەڕاستی ناوچەکە .

خەسلەتی سرووشتی ومرۆییەکان ڕۆلێکی کاریگەریان هەبووەلە دیاریکردنی ئەم تەرزانە،لەم فاکتەرانەش:-

## فـــــــــاكتەری سروشـــــــــتی:-

سەرچاوەكانی ئاولەپێشەنگی ئەو فاكتەرانەیە كەوێنەی تەرزی نیشتەجێ بوونیان لـەم ناحیەیە دیاری كردووە،ئەم پەیوەندیەش لـە تێبینیكردنی هەردوو نەخـشەی نـشینگەكان وسەر چاوەكانی ئاو بەدیار دەكەوێ چونكە پێگەی نشینگەكانی هـەمان پێگـەی كـانی وكانیاوەكانـە یـان لەنزیكیـەتی.ئـەم پەیوەندیـەش سروشـتی بـەرزی ونزمـی سـەخت سەپاندوویەتی،چونكە وایكردوە ئەستەم بێـت پـشت بـە ڕووبـارێ (تاینـال)و جۆگـەی (ئاوی بازیان )و جۆگەلەكانی تری كەلەدۆڵی تەسكو قوڵە ببەستێ ،بۆیەش دەبینرێ كە پێگـەی نـشینگەكان كاریگـەر نـەبووە بـە درێـژ بوونـەوەی جۆگـە ئاویەكان،بۆیـەش دانیشتوانی ناوچەكە بۆ چـالاكی كـشتوكاڵی پـشتیان بەكـشتوكاڵی دێمـی بەسـتوەو وەرزی زستانیش وەرزی سەرەكی چاندنە لەلایان وهەروەها بەروبوومی زستانە داهـاتی سەرەكیانە.بۆ نمونە تێكرای ڕوبەری چانراو لە ساڵێكدا (٩٢٨٠٠) دۆنمە لەناحیەكە و چاندنی گەنم و جۆ لـە زستاندا (٧٥٠٠٠) دۆنمـە كەرێـژەی (٨٠,٨٪) پێكـدێنێ لـە تێكرای ڕووبەری چاندراو لـە ساڵێكدا.لەكاتێكدا بەرووبومی هاوینە ڕێـژەكی بـچووك دەگریتەوە لەوانەش:توتن كـە (١٠٠٠) دۆنم دەگرێتەوەوسـەوزەوات (١٦٠٠ ) دۆنم بـرنج (٢٠٠٠)دۆنم.گومـانیش لەوەدانیـە كـە هـەر پرۆژەیـەكی بـەرەو پێـشبردنی كشتوكاڵی هاوینە دەبێت بە دیراسەكردنی توانای دابین كردنی ئاو لە كانیاو بیرەكـان وجۆگەلە ئاویەكان دەست پێ بكات .

بەرزونزمی ناوچەكەش ڕەنگدانەوەی هەبووەبەسەر جۆری خاك لـەڕووی خەسـلەتە كیمیایی و فیزیاییەكان ،چونكە خاكەكە جبسی تەنكـەو چـەند بـەرەو چـیاكان بـڕۆین تەنكتر دەبێتەوە ، لەبەر هۆكارەكانی داماڵین بەتایبەتی داماڵینی ئاوی ئەوا خاكەكەی لە دۆڵەكان و پێشەنگی چیاكاندا كۆبۆتەوە ئەو خەسلەتە جیمۆر فۆلۆجیایانەش كاریگـەر بووە بەسـەركەمی زەووی لەباربۆكـشتوكاڵكردن ودابـەش بـوونی بەشێوەیەكی پـچڕ پچڕ،كە ئەمەش ڕێگرە لەبەردەم بەردەستكردنی توانستی كێڵگەی فراوان.

شوێنی ناحیەی بازیان لە نێوان ناوچەی شاخاوی وایکردووە زەوی تەخت وکەم لێژ،کە بواری کشتوکاڵکردن دەدات پچڕپچڕوبەیەك نەبەستراوبێت ورووبەریان کەم بێت،بەم شێوەش ئەم حاڵەتە تەنها بۆ ژێوی گوندی قەبارە بچووك دەدات بەتەنها.خەسلەتەکانی ڕووی زەوی نەخشەی ژمارە ( ٥ ) بەدەری دەخات.ناحیەکە بەشێوەیکی گشتی دەکەوێتە ناوچەی شاخاوی و سنوری کارگێری لەگەڵ زنجیرە چیاکان دەڕوات و بازیان کە دۆلێکی نێوانیانە چەندین جۆگەو چەندین گردو تەپۆلکەی بچوکی تیادایە . زنجیرە چیای بازیانیش کە ناوچەی دەرەکیەکانی چیاکەم ئالۆزەکان پێك دێنیّ کەلەدۆڵی سیروان لە نزیك لقی دێوانە دەست پێدەکات بەرەو ئاراستەی باشوری خۆرهەڵات بۆ باکوری خۆرئاوا دێت تابزر دەبێت لە دووری (١٦)کم لەزێی بچوك ئەو زنجیرەش بەچیای لێژ دەست پیّ دەکات وەکو چیای زەردە (١٧٧١ )م کەدەربەندی سەگرمە لەدووری (٤٨٩) کم لەزێی سیروان دەبڕێت. لەبەر سرووشتی بەرزوو نزمی ناوچەکەوداباریني بەفرو باران بەتێکڕای ساڵانەی زیاتر لە (٧٠٠) ملم وچالاکی فاکتەرە جیمۆر فۆلۆجیەکان،کانیاوسەرچەشمەکان بڵاوە بوونە لەناوچەکەوناوچەی شاخاوی هەرێمی کوردستان بەشێوەی گشتی،ئەو کانیانەش پێگەی گوندەکانیان دیاریکردووە هەروا قەبارەو تەرزی دابەش بوون وچڕی دانیشتوانی بەشێوەیەکی گشتی .

فاکتەرە مرۆییەکان :-

لەپاڵ فاکتەرە سرۆشتیەکان فاکتەرە مرۆیەکان کاریگەریان هەیە بەسەر تەرزی دابەشبوونی نشینگەکان لەرێگەی هۆکاری ئابوری وکۆمەلایەتی وهۆیەکانی گواستنەوە .هۆکارە ئابوریەکان کە لەشێوازی بەکارهێنان وجۆری بەروبوم وبەگەرخستنی زەوی دەگرێتەوە،لەپێشەنگی فاکتەرە مرۆییەکان دی.لەم ڕوانگەیەوە دانیشتوانی ناوچەکە پشت بەچالاکی کشتوکاڵ دەبەستن،کە ئایاچاندنی بەروبوم بیت یان بەخێوکردنی ئاژەڵ

یان هەردوو چاڵاکی .لەم خشتەی داهاتوو دەکرێ سرووشتی چاڵاکی کشتوکاڵ دەست نیشان بکەین :

خشتەی ژمارە (٢٠)

ڕووبەری چیندراوو لە ناحیەی بازیان و پارێزگای سلێمانی(دۆنم)

| بەرووبووم | بازیان | پارێزگا | بەرووبووم | بازیان | پارێزگا |
|---|---|---|---|---|---|
| القمح | ٦٥٣٠٠ | ٩٥٠٩٠١٠ | الرز | ٢٠٠٠ | ٩٤١٤ |
| الشعير | ١٠٠٠٠ | ٢٦٧٣٥٠ | القگن | ٥٠ | ٥٧٣٩١ |
| الباقلاو | ٨٠ | ٣٢٢٩ | التبغ | ١٠٠٠ | ٣٢٥٥٠ |
| البصل | ١٤٠ | ٣٥٦٠ | السمسم | --- | ٥٧٠ |
| العدس | ٧٣٠ | ٦٧٨٠ | الذرە الصفراو | --- | ٤٠٢ |
| الحمص | ١٩٠٠ | ٨٩١٠ | الماش | ١ | ٨٠٥ |
| الكتان | ٣٠٠ | ٧١٣٠ | عباد الشمس | ٨٠ | ٤٨٨٩ |
| بنجر سكری | ٩٠ | ٢٨٢٢ | الگماگە | ١٥٧٠ | ١١٧٩٥ |
| الخضروات الشتویە | ١٠٠ | ١٦٢٦ | الخضروات الصیفیە | ٣٩٠ | ٨٥٤٠ |

سەرچاوە/

- وزارة الزراعة،مديرية التخطيطوالمتابعة،خطة الانتاج الزراعي لعام(١٩٧٣-١٩٧٤)،بغداد.
- هيئة الزراعة العامة،محافظة السليمانية،قسم التيبوغ،سجلات غير منشورة.

لەم خشتەیە واتێبینی دەکەین کشتوکاڵی زستانە کە پشت بەباران دەبەستێت زیاتر لەچوار لەسەر پێنج ڕووبەری چانراوو پێك دێنێ ساڵانە.ئەم کشتوکاڵە دێمەش بنچینەکەی چاندنی گەنم وجۆیە و ڕێژەی بەرهەمهێنانی گۆڕاوە لەساڵێکەوە بۆ ئەوی ترلەبەر جیاوازی ڕادەی باران بارینی. بۆیەش دەکرێ بلێین کە ئابوری ناوچەکە

ئابوریکی کشتوکاڵیەوپشت بەهۆکارە سروشتیەکان دەبەستیٚ لەکاتیٚکدا فاکتەرە مرۆییەکان رۆڵیٚکی ئەوتۆیان نیە.ڕوی زەوی سەختیش ڕەنگدانەوەی خۆی هەیە لەپەرشو بلاوی زەوویە چاندراوەکان ورووبەری بچوکی وزەحمەتی بەکار هیٚنانی ئامیٚری کشتوکاڵی . بچوکی ڕووبەری کیٚلگەی کشتوکاڵی ڕنگدانەوەی هەبووە لەسەر بچووکی قەبارەی گوند.بۆیەش بونی گوندیٚکی بچووك لەپاڵ گوندە گەورەکۆنەکە زیاتر بۆ لاوازی توانستی زەوی دەگەڕیٚتەوە بۆ بەخیٚوکردنی دانیشتوانی زیاتر لەڕادەی خۆی هەروەها کانیەکەش ئەو توانایەی نیە.ژمارەی کشتیارەکان ١,١٨٠ کەس بوو کەلەسەر زەوویکی کشتوکاڵی کار دەکەن ڕووبەرەکەی ١٠٨,١٢٥ دۆنە . ئەوەش بەلگەی ئەوەیە کەژمارەیکی زۆر لەدانیشتوانی کاری شوانکاری دەکەن ولە وەرزی هاویندا دەچنە لوتکەی شاخەکان و بەرزایەکانداو لە زستاندا دەچنە خوارەوە بۆ دەشت ودۆلەکان لەگەرانیان بەدوای لەوەڕگا.ئەو ئاژەڵانەشی بەخیٚو دەکەن بریتیە لە مەڕو بزن بەشیٚوەی سەرەکی.سەبارەت بەفاکتەرە کۆمەلایەتیەکانیش لەولایەنەوە کاریگەرە کەپیٚوستی بوون بەژیانی کۆمەل لەنیٚو گوندەکەدا نیشتەجیٚبونی دابراو بەدووردەخات کەنیشانەی ئازادی کۆمەلایەتیە وەك ئەوەی لەئەوروپا دەبینریٚ . بارودۆخی نائارام ونەمانیی ئاسایش لە پیٚش دامەزراندی دەوڵەتی عیراق کاریگەری زۆری هەبوو لە مانەوەی ئەو شیٚوازە لە کۆمەڵ کەئەوەش گرنگە بۆ دامەزراندنی کیٚلگەی بەکۆمەڵ کە باشترین شیٚواز دەستەبەر دەکات بۆبەگەر خستنی زەوی بۆ کشتوکاڵ کردن.لەبەر نەبوونی پلانی کشتوکاڵی زۆرجار ململانی لەنیٚوان کشتیارەکان و شوانکارەکان سەری هەڵدەدا بۆیە پیٚویست بوو ژیانی بەکۆمەل هەبیٚت لە سنوریٚکی دیاری کراودا.دۆلەکان و نیٚوان چیاکاندا ڕیٚگەی گواستنەوەی سەرەکی ولاوەکی لەنیٚوان گوندەکان پیٚك دیٚنیٚ وگوندەکانیش بەزۆری لەجیٚگای دوور لە ڕیٚگا سەرەکیەکان ئاکنجەن لە بەر بارودۆخی باسکراوو لەمەو پیٚش .

**خانـــــــــــووی دێهـــــــــاتی:-**

جوگرافیزانەکان بایەخیان داوەتە خانوی دێهاتی لـەڕووی تـەرزی دابـەش بـوونی و شـێوازی بڵـاوبوونی وکەرسـتەی بینـاو نەخـشەی و ئـەو بـارو دۆخـە ژینگەیـەی کەکاریگەربووە بەسەری و ڕۆلێکی بەرچاوی گێڕاوە لەدامەزرانی،لێرەدا (ڕود فێلد ) وای دەبینێت کە دیراسەکردنی خانووامان لیدەکات شـارەزا ی هەڵـسو کەوتی ژیـانی هەرکۆمەڵگایەك بین،وەکودیاردەیەك لـە دیاردەکانی ئاویتەبوون لەنێوان ژینگەو مـرۆڤ .

خانوی دیهاتی لەناوچەی بازیان شێوازیکی دیاری کراوی وەرنەگرتووە یان ئاراستەکی جیاکەرەوە.چونکە لەهـەر شـوێنێکی جوتیـار دابـەزیبێت خانوەکانیـان لـەنزیك سـەر چاوەی ئاو یا زەویەکی کشتوکاڵی دامەزراندووە،بەم شـێوەیەش سیـستەمی ئەنـدازەیی دیاری کراو نیە وابکات ڕێگـای نێـوان خانوەکـان و شـێوەی خانوەکـان ڕێکـو پێـك بێـت.تێبینـی دەکـرێ کـە جوتیـاران لەناوچەشـاخاویەکاندا لـەکاتی دامەزرانـدنی خانوەکانیان بەرەو ڕووی باشور دەیکـەن کەهـەتاوی بەردەکـەوێ ودووردەکەونـەوە لەناوچەکانی کە بای لێ هەلدێ و ساردە.لەم ناوچەش خانوەکان کۆدەبنەوەوبەیەکـەوە لکێنراون وتەرزی کۆوە بوو وەردەگـرێ لـە ناویـەك گونـدا، لەکاتیکـدا خانوەکـان لەناوچەکانی ناوەراست و باشوری عێراق بەتەرزی بڵاوەبوو دەناسرێ .

**پێکهاتەی خانـــــــــووی دێهاتی:-**

سادەترین خانووی دێهاتی دەکرێ خانوویەکی تاك بێ کە پێکهاتووە لە ژوورێك کـە کەشتیار وەکو داڵدەیەك بۆخۆی وخێزانی بەکاری دەهێنێ وهەنـدێ جـاریش لەوانەیـە ئـاژەڵ و بەروبوومیـشی تیـادا هـەڵبگیرێ.هەرچـەندە قـەبارەی خێـزانیش گـەورەبێت ژوورەکان زیاتر دەبێـت و ڕووبـەری خـانوو گـەورەتر دەبێـت وەکـو دەرئـەنجامێکی جێابوونەوەی خێزانە تازەکان لەخێزانە سەرەکیەکە گۆرانکـاری لـە قـەبارەی خێزانـدا ڕوودەدات کەزیاتر بەرەو بچوك بوونەوە دەبێت.هەروا زیادبوونی دانیشتوان زۆر جـار وادەکات ژمارەی خانووەکـان زیـاد بێـت.خـانوی دێهـاتی لەناوچـەی بازیـان چـەند

ژووریك لەخۆ دەگریت کەدەگونجیّ لەگەلّ توانای ئابووری کەشتیار جگە لەبوونی حەوشێك لەناوەڕاستی خانووەکە . حەوشەکە یارمەتی ئالوگۆرکردنی هەوادەدات بۆ فێنك کردنەوەی خانووەکە لەهاویندا و لە زستانیش وادەکات تیشکی خۆر لەژوورەکان بدات سەرباری ئەوەی شوێنی نووستنی خیزانەکەیە لە هاوین لەوانەشە بۆڕاگرتنی ئاژەلیش بەکاربهێنریّ.خانووەکانی بازیان بەوە جیادەکرێتەوە کە دوو ژور یان سیّ ژور هەیەولەناوەڕاستی بەشێکی سەقف گیراوو هەیە کە وەکو هۆل بەکاردێت هەروەها هەیوانێك هەیە کەئەندامانی خێزانی تیدا دادەنیشێت . زۆربەی ژوورەکان کون وشوێنی کراوەی بازنەیی یان چوارگۆشە دەگرێتە خۆلەپالّ پەنجەرەیەکی بچووك لەکاتیکدا دەرگاکان بچووکن .بۆیەش ئەو ژوورانە تاریك دەبن لەکاتی ڕۆژدا.کەمی و بچوکی پەنجەرەو دەرگاکان بۆ کۆمەلێك هۆکار دەگەریتەوە لەوانە نزمبوونەوەی پلەی گەرمی لەزستان و هەلکردنی بای سارد لەپالّ دەستگرتن لەتێچوونی خانوو شارەزانەبوو لەلایەنی تەکنیکی بیناکاری.خانوەکان لیرەدا بەشێوەی ڕیز ڕیز دروست دەکرین کەمرۆڤ دەتوانیت بەئاسانی گوزەر بکات لەسەربانەکان تادەگاتە ڕێگایەك.زۆرجاریش گوندەکان دۆلێك دەیانبڕی لەناوەڕاستدا، بۆیەش خانوەکان لەهەردوو لای دادەمەزریّ لەپالّ چیاکەدا و بەرامبەر یەکترین .
بیانکردنی خانوو دەکەوێتە ئەستۆی خیزانەکە،کە قەبارەکەی ڕۆلی تیدا دەگیڕیّ لەگەلّ یارمەتی دانی کەسە نزیکەکانی ولەلیژاییەکانی بەرەو باشور دادەمەزریّ لەکاتێکدا پشتی خانووەکە دەچێتە ناو زەوی تانیوەی لەو ئاراستەی بای سارد هەلدەکات.ئاشکراشە ئەو شوێنانەی بەرەو ڕووی باشورو خۆرئاوایە و تیشکی خۆری زیاتر بەردەکەویّ لەو شوێنانەی بەرەو ڕووی باکوری خۆرهەلاتە ،بۆیەش خانووەکان لەناوچە شاخاویەکاندا لەوشوێنانە بینادەکریّ کەبەرەو ڕۆژەو لە بەرزیەکی دیاریکراودا.ئەم حالەتەش وای کردووە کە خانووی دێهاتی دیمەنێکی تایبەتی

وەگرێت،چونکە پشتی خانووەکە لـەدەرەوە زۆر بـەرز نیـە لەکاتیکـدا لـەژوورەوەدا دەگاتە چەند مەترێ .

کەرستـــــــــەی بینـــــاکاری:-

پێکهاتەی خانووی دێهاتی وکەرستەی بیناکـاری پەیوەنـدی بـەهێزی هەیـە بەئاسـتی ئابووری ومەبەست لە بیناکردن وشێوازی ژیانی.دێهاتیەکان پـشت بەژینگـەی خۆمـالی دەبەسـتن بـۆ دەستەبەرکردنی کەرسـتەی بینـاکردن بۆیـەش سـەیر نیـە کـە زۆربـەی خانووەکانی ناحیەکە بە خۆل وگڵ و بەرد دروست کراون . لە پاڵ کاریگەری ژینگەی خۆمالیش لە بنیادنانی خانوو ، ئەم کـارە پەیوەسـتە بـە مـەودای بـوونی کەرستەکەو تێچوونی گواستنەوەی.چونکە لەوانەیە خەڵکی گوندەکە خانووەکانیان بـەو کەرسـتانە بکەن کە لەشاردا هەیە وباشترە،بەڵام نەریتەکە ئەوهایە کەخانووەکە لەخشت دروسـت بکرێ لەو شـوێنەی گـڵ هەیـە و دار درووسـت بکـرێ لـە دارستـانەکان و لەبـەرد درووست بکرێ کە هیچ کەرستەیەکی تر نیە جگـە لـەوە .تێبینـی دەکـرێ کـە بـەرد کەرستەیەکی سەرەکی بیناکردنە لەناحیەی بازیان ، بـەردەکانیش بـە قـوڕ یـان گـەچ دەخرێنە سەر یەك و کونەکانیان پڕدەکرێتەوە پێی.گرنگی بـەکار هێنـانی بـەرد لێـرەدا تـەنها ئەوەنیـە کـە زۆرە لـەم ناوچـەویە ، بـەڵکو لەبـەر بەرگریکردنـە لـە شـێداری وباران.لەپاڵ بەردیش خشت بەکار دیت لەوناوچانەی تەختایی و نزمە بۆیـەش ڕێـژەی بینـای خـشت هاوشـێوەی بـەردە.لەخـشتەی (٢١)بۆمـان دەردەکـەوێ کەبـەرد کەرستەیەکی سـەرەکی بیناکردنـە ،چـونکە لـە ( ٤٨٪ ) خانووەکـان بـەو بنیـادنراوە لەکاتێکدا ئەو ڕێژیە (٢٧٪) بووە لە دیهـاتی پارێزگـای سـلێمانی.بیناکـاری خـشت لەپارێزگا (١٢٪) بوو لە ناحیەی بازیان ٤٧,٩٪ بوو . لەلایەکی ترەوە ڕێـژەی ئـەو خانوانەی کە خیوەت وڕشماڵ وکوخن سێ ئەوەندەی پارێزگای سـلێمانی بـوو.ئـەوەی جێگای ئاماژەیە لێرەدا ئەوەیەکە جیاوازای زۆر هاتەدی لە جۆری کەرسـتەی بینـا لـە نێوان ماوەی سالآنی (١٩٦٥ - ١٩٧٧ )، چونکە لەکاتێکدا سەر ژمێری (١٩٧٧ )

ئەوە دەسەلمێنێ کە نزیکیەکی ئاشکرا هەیە لە بەکار هێنانی بەردوو خشت،بەڵام لە ساڵی (١٩٦٥) جیاوازی زۆر نیشان دەدات ، بۆ نمونە بیناکاری خشت (٩٩٪) کۆی گشتی خانووەکان بوو بینای بەردیش کەم تر بوو لە (٠,٣٪)بڕوانە خشتەی (٢١) ، ئەمەش حالەتێکی نەشازەو ناسەلمێنرێ لەبەر ئەو هۆکارانە :

١- بناغەی خانوەکان زۆر جار بەبەرددروست دەکرێت دواتر بەخشت،بۆیە وەکو ئەوە دیارە کەخشت بێت .

٢- بیناکاری بەرد زۆر جار بەقور دادەپۆشرێ،بۆیەش وەکو بیناکاری خشتە .

٣- هەڵەوکەموکوڕی داتاکان (١٩٦٥) لەبەرنالەباری بارودۆخی ناوچەکە لەوکاتەدا وایکردوە داتاکان بەخەمڵاندن بێت نەك بەواقیع .

خشتەی ژمارە (٢١)

خانووی دێهاتی لە ناحیەی بازیان و پارێزگای سلێمانی بە پێی کەرەستەی بینا لە ماوەی (١٩٦٥-١٩٧٧)

| کەرەستەی بینا | یەکە جێنشینەکان ٪ | | | |
|---|---|---|---|---|
| | پارێزگای سلێمانی ١٩٦٥-١٩٧٧ | | ناحیەی بازیان ١٩٦٥-١٩٧٧ | |
| بەرد یا کەرپورچ | ٢٣,٧ | ٢٧,١ | ٠,٣ | ٤٨,٣ |
| قور یا خشت | ٧٠,٣ | ٧١ | ٩٩,٧ | ٤٧,٩ |
| کوخ یا سەریفە | ٤,٩ | ٠,٤ | --- | ٠,١ |
| خیوەت یا رەشماڵ | ١,١ | ١,٢ | --- | ٣,٥ |
| خانووی ئامادەکراوو | --- | ٠,٠٤ | --- | --- |
| جۆری تر | --- | ٠,٢٦ | --- | ٠,٢ |

## خشتەی ژمارە ( ٢٢ )

## خانووی دێهاتی لە ناحیەی بازیان بە پێی کەرەستەی بینا لە ساڵی (١٩٧٧)

| کەرستەی بینا | ژمارەی یەکەکان | یەکە جێنشینەکان ٪ |
|---|---|---|
| بەرد یا کەرپووچ | ٨٩٨ | ٤٨,٣ |
| قور یا خشت | ٨٩٢ | ٤٧,٩ |
| کوخ یا سەریفە | ١ | ٠,١ |
| خیوەت یا رەشماڵ | ٦٦ | ٣,٥ |
| خانووی ئامادەکراوو | ١ | --- |
| جۆری تر | ٣ | ٠,٢ |
| کۆ | ١٨٦١ | ١٠٠ |

سەرچاوە/

- وزارة الداخلية،مديرية الاحوال المدنية،الجداول الاساسية لنوع المسكن الريفي لعام١٩٦٥.
- وزارة التخطيط،نتائج احصاء السكان لعام ١٩٧٧(جدول٢)غير منشور.

**دۆخی جێ نشینی لەناحیەی بازیان :-**

دیاردەی دێ نیشینی گرنگیەکی بەر چاوی هەیە لەرێگەی گونجاندنی لەگەڵ ئاراستەی ئابووری وکۆمەلایەتی بۆ بەرەوپێش چوونی ژیانی دانیشتوان وبەو پێیەی کە بنچینەو ئامانجی پەرەپێدانن کە دەولەت هەوڵی بۆدەدات.گومانیش نیە کەفراوان بوونی خێزانی تازە،جگە لە بەردەوام بوونی نیشتەجێبوون شوانکارەکان وادەکات دیاردەی جێنیشینی گرفتێکی یەکجار مەترسیدابێت.جێنیشینی دێهاتیش کەلەبنەڕەتدابەشێکە لە پەرەپێدانی دێهاتی وجیاناکرێتەوە لەژیانی رۆژانەی کەشتیار لە کێڵگەو زەویەکەیدا ، سەرەڕای ئەوەی کە مانەوەی دێنشینەکان لەچوار چێوەی گوندی بچوك ودابڕاو دیاردەیەکی کۆمەلایەتی نەویستەو لەگەڵیدا ناکرێ هیچ پرۆگرامێکی چاکسازی پراکتیك بکرێ کەمەبەستی گۆڕانکاری و بەرەوپێش چوونی توانستە شارستانیەکانیان بێت.لەژێر رۆشنایی ئەوەی باسکرا دۆخی جێنیشینی دوو ئاراستەی هەیە :

یەکەمیان : تایبەتە بەتەرزی دابەشبوونی جوگرافی نشینگەو خانووەکانی .

دووەمیان : تایبەتە بەپێویستی بوونی بەردەوام بۆ خانوو کە بگونجێ لەگەڵ پێداویستیەکانی مرۆڤ وخێزانەکەی .
بۆئەوەی باشتر شارەزای پێویستی دانیشتوان بین بۆ خانووی دێهاتی لێرەدا باسێکی بەرەو پێش چوونی جێنیشینی دەکەین لەناحیەکە.
بەرەوپێشچوونی دیمۆگرافیی دۆخی جێنیشینی:-
لەژێر ڕشنایی داتاکانی تایبەت بە دانیشتوان وخانوو بۆ ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٦٥ – ١٩٧٧ )وادەرکەوتوە کە ناهاوسەنگیەکی زۆر هەیە لەناحیەکە لەنێوان زیاد بوونی خێزانەکان بەرامبەر زیاد بوونی خانوو.بۆ نمونە ساڵی ١٩٦٥ ژمارەی خێزانەکان (١٤٠٨) خێزان بوو لەکاتێکدا ژمارەی خانوو (١٥١٣ ) بوو ، بەو شێوەیەش دەرئەکەوێ کەزیاد بوونێك لەژمارەی خانوو هەیە ، کە ئەوەش ڕاست نیە بە قەدەر ئەوەی کەم وکوڕی داتاکانە لە هەژمار کردنی ژمارەی دانیشتوانە بەشێوەیەکی وورد بین .
لەسالی (١٩٧٠) ژمارەی خیزانەکان گەیشتە (١٧٤٧) خێزان ، بە واتای ٤,٨٪ سالانە لەکاتێکدا نزمبوونەوەیەك ڕوویدا لە ژمارەی خانوو کەئەوەش بووە مایەی پەیدابوونی پێویستی بەخانوو بەرێژەی (١٩٪) ئەو پێویستیەش بەردەوام بەرز بووەوە لەسالی (١٩٧٧) ، چونکە ژمارەی خێزانەکان بووە (٢٢٦٥) خێزان ، بەرامبەر (١٩٠٨) خانوو بەواتای پێویستی بە ڕێژەی (١٦٪) .
دەکرێ بلێین ماوەی نێوان (١٩٦٥ – ١٩٧٧ ) زیاد بوونێکی ئاشکرای دانیشتوانی گرتەخۆ بەرێژەی (٣,٩٪)و ژمارەی خێزانەکان لە (٥٪) زیاتر بوو لەکاتێکدا ژمارەی خانووەکان رێژەی (٢,٢٪) بوو. دیاردەیەکی ئەوها بێگومان پێویستی کارکردن بۆ کەمکردنەوەی ناهاوسەنگی نێوان خێزان و خانوو پێویست بوی دێنێتە ئاراوە بۆ مسۆگەرکردنی بەشی هەر خێزانێك لەخانوو، جگەلە زانینی ڕادەی پاکو خاوێنی خانووەکان بۆ ژیانی مرۆڤ .

خشتەی ژمارە (٢٣ )

دۆخی نیشتە جێبوون لە ناحیەی بازیان لە ماوەی(١٩٦٥-١٩٧٧)

| ساڵ | ژمارەی دانیشتوان | ژمارەی خێزان | ژمارەی یەکە جێنشینەکان |
|---|---|---|---|
| ١٩٦٥ | ٨٤٤٧ | ١٤٠٨ | ١٥١٣ |
| ١٩٧٠ | ٩٣٣٧ | ١٧٤٨ | ١٤١٢ |
| ١٩٧٧ | ١٢٤٤٣ | ٢٢٦٥ | ١٩٠٨ |
| ڕێژەی زیادبوون لە ماوەی ١٩٦٥-١٩٧٧ | ٪٣,٩ | ٪٥,١ | ٪٢,٢ |

سەرچاوە/

- وزارة الداخلية،مديرية الاحوال المدنيةالعامة،نتائج تعداد السكان لعام١٩٦٥ السجلات الاولية لنوع المسكن الريفي
- وزارة التخطيط،الجهاز المركزى للاحصاء،خلاصةنتائج حصر السكان لعام ١٩٧٠٠محافظة السليمانية).
- وزارة التخطيط، الجهاز المركزى للاحصاء ،نتائج تعداد السكان لعام ١٩٧٧.

**دێ نشینی هاوچەرخ لەناحیەی بازیان:-**

دێ نشینی هاوچەرخ لەعیراقدا،لەگەڵ دامەزراندنی گوندو پێش خستنی ناکری بەهیچ شێوەیەك جیا بکرێتەوە لەبابەتی پەرەپێدانی دێهاتی بەشێوەیەکی تایبەتی و پەرەپێدانی نیشتیمانی بەشێوەیەکی گشتی . لەپارێزگای سلێمانی چاڵاکیەکی نائاسایی پەیدابوو بۆ دووبارە ڕێکخستنی نیشینگە دێهاتیەکان ، چونکە بریاردرا (١٨٩٠٩) کرێکار لە (٣٩٨) گوند کۆبکرێتەوەودابەشکرێنە سەر (٥٦) نیشینگە کە (٢٥١٢٢) خانوو دەگرێتەخۆو هەرخانویەك دوو ژورر و نانەدین و هەیوان و حەوشێك و پێداویستی خزمەتگوزاری تری تێدایە.

# سەرچاوەو پەراوێزی بەشی شەشەم


١- بروانە:

أ- مديرية الاثار العامة،المواقع الاثرية في العراق،مطبعة الحكومة،بغداد،١٩٧٠،ص ٣٤٦-٣٤٧.

ب- طة باقر،مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة-القسم الاول(تاريخ العراق القديم)،الشركة التجارية للطباعة المحدودةنبغداد،١٩٥٥،ط٢،ص١٠.

٢- عەبدوللا غەفور،جوگرافیای کوردستان،دەزگای مۆکریانی،هەولێر،چ٤، ٢٠٠٥، لا٢٢٩.

٣- خليل اسماعيل محمد، انماط الاستيطان الريفي في العراق،المصدر السابق،ص٢٦.

٤- لیژەك ژیگیل ،گوندوشارۆچکە گوندییەکانی عێراقی ئێستا،وەرگێرانی عەزیز گەردی،چاپخانەی هاوسەر،هەولێر،٢٠٠٠،لا٩.

٥-کاوس قەفتان،چەند لێکۆلینەوەیك لە مێژووی(بابان-سۆران-بۆتان)،چاپخانەی ئەل حەوادیس،بەغدا،١٩٨٥،لا٧-٩.

٦- شاكر خصباك،الاكراد(دراسة جغرافية اثنوغرافية)،مطبعة شفيق،بغداد،١٩٧٢،ص٣٣٥.

٧-هەمان سەرچاوە،لا١٨٠-١٨١.

٨- ئەحمەد محمەد ساڵح،شیکردنەوەییکی جوگرافی دابەشبوونی نشینگە دێهاتییەکان لە قەزای شارباژێردا،نامەی ماستەر،کۆلیجی زانستە مرۆڤایەتییەکان،زانکۆی سلێمانی،٢٠٠٦،لا٤٧.

٩- احمد طه شهاب الجبورى،الاستيطان الريفى فى قضاء الحويجة،رسالة ماجستير،كلية الاداب،جامعة بغداد،١٩٨٧،ص٧٢.

١٠- حمدى احمد الديب،فى جغرافية العمران الريفى،المصدرالسابق،ص٣٦-٣٧.

١١- محمد شرتوح الرحبى،كفاءة التوزيع المكانى لمراكز الاستيطان فى محافظة نينوى،رسالة دكتوراة،كلية الاداب،جامعة بغداد،١٩٩٠،ص١٤٢.

١٢- ايوب خليل اسماعيل،مورفولوجية القرية فى الاقليم الجبلى(دراسة ميدانية فى محافظة اربيل)،رسالة ماجستير،كلية الاداب،جامعة صلاح الدين،اربيل،٢٠٠٣،ص

١٣-فؤاد حمة خورشيد،القرية الكردية،مجلة المجمع العلمى،الهيئة الكردية،المجلد(٢٧-٢٨)،بغداد،ص١٠٨-١٠٩.

١٤- خليل اسماعيل محمد،سەرچاوەی پێشوو،لا٢٠٧.

١٥- صبرى فارس الهيتى و خليل اسماعيل محمد،جغرافية الاستيطان الريفى،وزارة التعليم العالى،بغداد،١٩٨٨،ص١٩٠.

١٦- ئەحمەد محمەد ساڵح،سەرچاوەی پێشوو،لا١٤٩.

١٧- صبرى فارس الهيتى،سەرچاوەی پێشوو،لا١٩٢.

١٨- خليل اسماعيل محمد،اقليم كردستان العراق(دراسات فى التكوين القومى للسكان)،مطبعة كريستال،اربيل،١٩٩٨.

١٩- خليل سعيد،معالم من حضارة وادى الرافدين،مطبعة النجاح الجديدة،الدار البيضاء،١٩٨٤،ص٢٩.

٢٠- ليژەك ژيگيل، سەرچاوەی پێشوو،لا٢٣

٢١- هەمان سەرچاوە،لا٢٥.

٢٢- خليل اسماعيل محمد، انماط الاستيطان الريفى فى العراق، المصدر السابق،لا١٠٤.

٢٣- محمد عبدا لله عمر اللهوني، التحليل الجغرافي للاستيطان الريفي في إقليم كوردستان العراق دراسة تطبيقية لمحافظة اربيل، اطروحة دكتوراة جامعة صلاح الدين، اربيل،٢٠٠٢،ص١٣٧.

٢٤- خليل اسماعيل محمدوايوب خليل اسماعيل،التحليل الجغرافى لتوزيع المستوطنات الريفية فى ناحيه قوشتەبە،گۆڤارى زانكۆ،گۆڤارى زانستە مرۆڤايەتييەكانى زانكۆى سەلاحەددين/هەولێر،ژمارە(٢٨)،چاپخانەى زانكۆى سەلاحەددين،٢٠٠٦،ل٣٣-٥٣.

٢٥- ايوب خليل اسماعيل،أ نماط التوزيع المكاني لمراكز الاستيطان الريفي في قضاء شقلاوة ،گۆڤارى زانكۆ،گۆڤارى زانستە مرۆڤايەتييەكانى زانكۆى سەلاحەددين/هەولێر،ژمارە(٣٢)،چاپخانەى زانكۆى سەلاحەددين،٢٠٠٧،ل٢٩٩-٣١٦.

٢٦- خليل اسماعيل محمدوعبد علي الخفاف،تحليل جغرافى لنمط الاستيطان الريفى فى ناحية بازيان/محافظة السليمانية،مجلة كلية الاداب،مطبعةجامعة البصرة،العدد١٧،لسنة١٩٨١